یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا!

ساڵی حەوتەم
76
تشرینی یەکەمی ٢٠١٤

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

## ژیان وەك چی؟!

## کەمەندکێشکردنی دڵو دەروونی خەڵکی!

## چۆن دەتوانیت سامانەکەت زیاد بکەیت؟

## ئاشتیی ماڵ!

## ئیمپراتۆری دڵم!

## یەکەمین ڕۆژی قوتابخانە!

## دڵنیابە سبەینێ ڕۆژێکی باشت دەبێت لە قوتابخانە..



## با لە جەژنی قورباندا
## دڵەکان سپی‌و لێوەکان خەندە بەخش‌و
## دەستەکان بەخشندەو نیگاکان میهرەبان بن!

No: 76

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:

مەسعود تـاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فـــارس

زاهـیــــر زانـــا

گوڵان حەمەئەمین

محەممەد مێرگەیی

محمد هاشم محمد

وەهـاب حەسـیب

یەحیـــا محەممەد

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر:- ئازاد محێدین

**بەشی هونەریو دیزاین**

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کلسوم جەلال



**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-
نهۆمی چواردم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر
٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com






دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك
07708649210

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد


نرخ 2500 دینار




# بڕیار


مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی حەوتەم - ژمارە 76 - تشرینی یەکەمی 2014




















## کارگێڕیو بازاڕسازی






# یەکەمین ڕۆژی قوتابخانە!

یەکەمین ڕۆژی قوتابخانە بۆ قوتابیانی یەکەمی بنەڕەتی، گرنگترین ڕۆژی ژیانیانە، کە هەرگیز دووبارە نابێتەوە، هەموو یەکێك لە ئێمە، ئەو ڕۆژەی لە یادەو هەرگیز دیمەنەکانی ئەو ڕۆژەی لە یاد ناچێت!

هەرچەندە زۆربەمان، یادگاریی خۆشو هەندێکیشمان یادگاریی ناخۆشمان هەن!

بەڵام هەرچۆنێك بووبێت، ئەو ڕۆژە بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە، شوێنەواری لەسەر هەموو ڕۆژەکانی دوای خۆی جێهێشتووە!

یادگارییەك، کە من هەرگیز لە یادم ناچێتو ئەگەر ئەو مامۆستایەش نەبا، کە من ئەوکات ناویم نەدەزانیو بە (مامۆستا سەرسپییەکە) ناوم دەبرد، ئەوا هەموو خۆشییەکانی ئەو ڕۆژەی زیندەبەچاڵ دەکردم!

لە بیرمە، ئەو ڕۆژە هەموومان خەریکبوو، لە ترسا زەندەقمان دەچوو، کاتێك ڕیزکرا بووین لە بەیانیەکی زوودا، کە لام وابێت (١/١٠/١٩٨١) بوو، هەموومان نیوەگیان بوو بووین!

بە تایبەت کاتێك، کە گوتیان تەفتیشتان دەکەن، ئەوەی هەر شتێکی پێبێت، لێی دەدەن!

منداڵان لەو تەمەنەدا هۆگری هەندێك شتیماڵەوەن، وەك یاریو هەڵماتو ئەو جۆرە شتانەو زۆر ئاساییە ئەگەر لەگەڵ خۆیانی بەرنە قوتابخانە!

لێتانی ناشارمەوە، بەندە تەنها "شەمامەیەکی بۆنخۆشم، لە باخەڵدا بوو!

بەڵام مەگەر بۆمبێکی ئەتۆمیشم لە باخەڵبا، هێندە نەدەترسام! مامۆستا سەرسپییەکە، کە من هەر وەهام ناودەبرد، چونکە بەڕێزیان، هەر بە گەنجی سەریان سپی بووبوو! بە ئەسپایی لێی ستاندمو لەبەرئەوەی باوکمی دەناسی، تێی نەسرەواندم!

زەمانی ئێمە، باشتر بڵێم لە ناوچەی ئێمە، باخچەی ساوایان نەبوو، بەڵام بە حوکمی ئەوەی من، لە نێو کتێبو قەڵەمدا، چاوم هەڵهێنا بوو، پیتەکانم دەزانیو کە خوێندن دەستی پێکرد، گرفتێکم نەبوو!

بەڵام سەرەتای خوێندنمان، وەها دەستی پێ نەکرد، کە شایان بە ئێمەی منداڵ بێت! هەرچەندە دواتر هەندێك مامۆستای میهرەبان هێندەیان میهرو خۆشەویستی پێدام، کە زێتر خۆشەویستی کتێبو قەڵەم، لە نێو دڵم ڕاچوو، بە شێوەیەك کە دەچوومە سەفەریش، لەگەڵ خۆمدا جانتاکەم دەبرد!

ئەوکاتەش کە لە پشووی نیوەی ساڵدا دەچومەوە "شێخان" لە ژێر ئاگری شەستیری کۆپتەرو گوللەبارانیشدا، جانتاکەم جێنەدەهێشتو لەبیرمە، کاتێك نیوەی ساڵ لە ئەلفبێی کوردیدا گەیشتبووینە "بلوێر لێدان"و لەوێ لە گوندەکەی خۆمان بۆ خزمانم دەخوێندەوە!

ئەوکات لەگەڵ ئێستادا جیاواز بوو، بەڵام دەکرێت ئێستا، گرنگییەکی تەواو، بەو ڕۆژە بدرێت! ئەو ڕۆژە، ڕۆژی پێشوازیکردنە لە کۆمەڵە خونچەیەك، کە هیوای ئاواتو ئایندەی میللەتێکن، دەبوا مەراسیمی پێشوازی لەو منداڵانەی کە بۆ یەکەم سات، پێ دەنێنە نێو دەروازەی قوتابخانەو لە داهاتوودا، ئەفسەرو دکتۆرو مامۆستاو پێشەواو سەرکردەی ئەم وڵاتەن، مەراسیمێکی زور شکۆدار بوایە، شکۆدارتر لە مەراسیمی پێکهێنانی حکومەتو واژۆکردنی گرێبەستی نەوتو سەرکەوتنی هەڵبژاردەکان! دەبوا لەو ڕۆژەدا، جگە لەو ئۆتۆمبیلانەی کە ئەو منداڵە چاوگەشانە دەگەیەننە بەهەشتی تەمەنیان، کە لانەی قوتابخانەیە، ڕێگە نەدرابا هیچ ئۆتۆمبێلێك بە شەقامەکاندا بگوزەرێت!

بە گوڵو گوڵاوو شیرینیو شەکراوی خۆشو خواردنی جوراوجۆرو چیرۆكو حەکایەتی خۆشەوە، خۆشترین ڕۆژی ژیانیان بۆ تۆمارکرابا!

هیوادارم وەکو ئێمە نەمانبینی، ڕۆژێك بێت، منداڵانی وڵاتەکەم ببینن، پێش ئەو ڕۆژە. ببینم کە خەمی گەورەترینو بەهادارترین گەنجینەی ئەم وڵاتە بخورێت، کە جگەرگۆشەکانمانە.

# کارگێڕی
## بە گوفتار

ئەگەر لە بەخشینی پاداشتدا، دەستت کورتە، ئەوا با لە بەخشینی سوپاسدا، زمانت درێژ بێت!

پەندێکی هەجەری

بەڕێوەبردنی کۆمپانیایەک، لە بەڕێوەبردنی خودی خۆتەوە دەست پێدەکات، هەرگیز ناگونجێت، ببیت بە کەسێکی گەورەو ناودار لە کارەکەتدا، ئەگەر هەست بە گەورەییی کەسێتیی خۆت نەکەیت..

رۆبین شارما

خۆت بەکەسانی دیکە، بەراورد مەکە، چونکە ئەگەر خۆت بە کەسانی دی بەراورد بکەیت، ئەوا تۆ سوکایەتیت بە خۆت کردووە!

هتلەر

مرۆڤ درووست بووە بۆ ئەوەی کاربکات، هەر وەکو چۆن باڵندە درووست بووە، بۆئەوەی بفڕێت!

رابلیە

وەکو درەختی صەندەل بە، تەنانەت بۆن بەو تەورەش دەبەخشێت، کە دەیبڕێتەوە!

شیرازی

# بۆ ئەوەی زوو بگەیت، پەلە مەکە!

«شویۆنگ» وێنەکێشی چینی، یەکێك بوو لە بەناوبانگترین وێنەکێشەکانی سەدەی حەڤدەهەم، ڕۆژێکیان بۆ گەشتێك، سەردانی شارێکی دەکرد؛ لەوپەڕی دەریا، بۆ ئەم مەبەستە سواری کەشتی بوو، بە کەشتییەوانەکەشی گوت، کە هەوڵ بدا پێش ئەوەی دەرگای شار دابخرێت، بیگەیەنێتە بەردەم دەروازەی شار، چونکە کات، ئێوارەیەکی درەنگەو شەو نزیکەو نیوەی شەویش کاتی داخستنی دەرگای شارە!

کەشتییەوانەکە تەماشای گورزە کاغەزو کتێبەکانی شویۆنگی کرد، کە زۆر بە شلی بەسترابوو پێی گوت: بەڵێ، پێش نیوەشەو دەگەیتە ئەوێ، ئەگەر بە خێراییەکی لە ڕادەبەدەر نەڕۆین!

کاتێك کەشتییەکە گەیشتە کەناری دەریا، شەو باڵی کێشابوو بەسەر شاردا، شۆیۆنگ لە ترسی ئەوەی دەرگاکانی لێ دابخرێت، زۆر بەخێرایی هەنگاوی دەناو بە گورجی ڕای دەکرد، بەڵام لەناکاو ئەو پەتەی کاغەزو کتێبەکانی پێ بەستبوو، پچڕا!!

هەموو کاغەزو کتێبەکانی لەو ناوەداو بەو شەوە تاریکە پەرش‌و بڵاوبوونەوە!

هەرچەندە هەوڵی دا، بەخێرایی کۆیان بکاتەوە، بەڵام لە کۆتاییدا دواکەوت! کاتێك گەیشتە دەروازەی شار، بینی دەرگاکان داخراون!

لەو ڕۆژەوە "شۆیۆنگ"، بۆی دەرکەوت کە هەمیشە پەلەکردن، لە بەرژەوەندیی کاتدا نییە! بەڵکو پەلەکردن یەکێکە لەو هۆکارانەی، کە دەبێت بە هۆی درووستبوونی کێشەو گرفتو بەربەست.

**لەم چیرۆکەوە فێردەبین:-**

١. هێدیبوون سەلامەتییەو پەلەکردنیش پەشیمانی.

٢. زۆرجار مرۆڤە بەئەزموون‌و دنیادیدەکان، بە شۆفێرەکان دەڵێن: پەلەمەکەن، دەمانەوێت بگەین! چونکە زۆرجار پەلەکردن، نەك دەبێت بە مایەی دواکەوتن، بەڵکو کارەساتی دڵتەزێنی وا درووست دەکات، کە ناهێڵێت هەرگیز بگەیت!

٣. خۆ ئامادەکردنی پێشوەختو دانانی کاتی یەدەگ، کارەکانمان زوو ڕادەپەڕێنێت، بەڵام خێرایی‌و شپرزەیی، هەموو شتێکمان تێکدەدا.

٤. بە خێرایی‌و پەلەکردن، ناتوانین قەرەبووی خاوی‌و تەمەڵی خۆمان بکەین‌و لە کاتژمێری سفردا بکەوینە هەڵپە،

٥. کاتی پەلەکردن‌و شپرزەیی، تەرکیزمان نامێنێتو کارەکانمان بەباشی بۆ ئەنجام نادرێت.

# تەنها بۆ سەرکردەکان

سەرکردایەتی لە ماڵی خۆتەوە دەست پێدەکات، درەخت هەرگیز بەروبوومەکەی، دوور لە خۆی ناکەوێتە خوارەوە، لەبەرئەوە بێگومان منداڵەکانت، زیاتر لەوەی پێشبینی دەکەیت، دەچنەوە سەرخۆت، تۆش دەتوانیت یارمەتی منداڵەکانت بدەیت، بۆ بەدەستهێنانی پلەبڵندی، بۆئەوەی ببیت بە چاوساغی ڕێگەیان. ڕۆبن شارما

ئەگەر تەنها لە یەك دوژمن خۆشبیت، چەندین دۆست بەدەست دەهێنیت! بوبلیلیوس سیروس

کەسانی خراپەکار، لەوانەیە لە سزای یاسا، ڕزگاریان ببێت، بەڵام هەرگیز لە سزای ویژدان، ڕزگاریان نابێت! پەندێکی عەرەبی

پێش ئەوەی بەخشندە بیت، دادپەروەر بە؛ چونکە هەمیشە پێویستییە بنەڕەتییەکان، پێش جوانکارییەکانن! شامفۆر

هەر کەس واز لە نارەزووبازی بهێنێت، بەسەربەرزی ژیان دەگوزەرێنێت! ئەناتۆل فرانس

# دیداریك لەگەڵ بەڕێز

## (م. پەروین ئەبوبەكر)

## مامۆستا لە زانكۆی سلێمانی بەشی كۆمەڵناسی

## سەبارەت بە: زانكۆو قۆناغێكی نوێ لە ژیانی خوێندكاردا

ئا: خەندە عوسمان

بێگومان زانكۆ قۆناغێكی نوێیە لە ژیانی خوێنكارداو جێگەی بایەخی خوێندكارە بۆ ناسینی ناوەندی زانكۆو ئەو شتانەی لە خۆی دەگرێتو خۆئامادەكردنو دانانی پلانی گونجاو بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەكانو درێژەدان بە كاروانی سەركەوتنی ژیانی خوێندكار..

- جیاوازی قۆناغی زانكۆ بەبەراورد بە قۆناغەكانی تری خوێندنو تایبەتمەندییەكانی چین؟

* خوێندن لە قۆناغی زانكۆ تایبەتمەندی خۆی هەیە، كە جیای دەكاتەوە لە قۆناغەكانی پێشووتر، زانكۆ جەخت دەكاتەوە لەسەر بەرزترین ئامانجو توانستی ژیری، ئەگەر ئەمە پراكتیك بكەین بەسەر پۆلێنەكەی زانای پەروەردەیی (بلوم) قۆناغی زانكۆ لە ئاستی باڵای پۆلێنەكەدایە كە (شیكردنەوە -پێكەوەنان- هەڵسەنگاندن) دەگرێتەوە، ئەمەش لە ڕێگەی ئامادەكردنی توێژینەوەی زانستیو پێشكەشكردنی بەرهەمی نوێو داهێنان لە واقیعی ژیانی خەڵكیداو توانای ڕووبەڕوبونەوەی كێشەكانو یارمەتیدانی خوێندكار بۆ زیادكردنو گەشەپێدانی لێهاتووییەكانی، بەرەو كاركردنو سەربەخۆبونی لە فیكرو داهێنانو توێژینەوەدا لە سنوری مەودای خوێندنەكەیدا، زانكۆ بینای ئایندەیەكی ئەكادیمی بۆ خوێندكار دەكات، كە قۆناغی پێش چونە بازاڕی كارە كە پشتدەبەستێ بە پسپۆڕی زانستی، هەروەها قۆناغی بوێریو تەواوكردنی بینای كەسێتی تاكە لە ڕووی جەستەییو ژیریو هەڵچونییەوە، خوێندكار لە زانكۆدا سەنتەری پرۆسەی فێربوونە، پشت بەخۆی دەبەستێتو بەدواداچون بۆ بابەتەكان دەكاتو زانیاریان لەسەر كۆدەكاتەوە لە ڕێگەی سەرچاوە زانستیەكانو ئەلیكترۆنیەكانەوە، مامۆستا ڕۆڵی ڕێنیشاندەر دەبینێو ئاسۆی بیری خوێندكار دەكاتەوە بە ڕووی شتە نوێیەكاندا، واتە خوێندكار كەمتر چاودێری دەكرێت لەلایەن دایكو باوكییەوەو كەمتر لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەكرێت، ئەمە لە ڕووی كۆمەڵایەتیو فێركارییەوە، لە ڕووی شێوازی وتنەوەی بابەتەكاندا تا ڕادەیەك جیاوازە، ئەمەش كە بە زۆری پشت دەبەستێ بە ڕێگەی موحازەرە لە وتنەوەی بابەتەكاندا، چونكە خوێندكار تایبەتمەندی وەردەگرێت لە بوارێكی وردو دیاریكراودا، لەگەڵ ئەوەدا كە پرۆگرامێكی دیاریكراو نییە تا تەواو پابەندبێت پێیەوە، بەڵكو هەر بابەتێك كە پەیوەندیدارە بە پسپۆڕییەكەیەوە پێویستە خوێندكار زانیاری هەبێت لەسەری.

- خوێندكار چۆن مامەڵە بكات لەگەڵ ئەم قۆناغە نوێیەداو ئەو شتانە چین كە پێویستە خوێندكار بیزانێت؟

* پێویستە خوێندكار بە هەستی بەرپرسیارێتییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم قۆناغە نوێیەی تەمەنی بكاتو ڕۆڵی خوێندكاری خۆی ببینێت، كە بریتییە لە زیادكردنی ئاستی زانیاریو فێربوونو بەرەو پێشبردنیو تێڕامانو بیركردنەوە لە بابەتی پسپۆڕییەكەی، كە بنەماكەی هۆشیاریو پێزانینە، بەرپرسیارییەكی تر لە ئەستۆی خوێندكاردا بەشداریكردنە لە چالاكی ڕۆشنبیری، بە مەبەستی سوودو كەڵكی كۆمەڵایەتیو گۆڕانی ژیانی تاكەكانی كۆمەڵگە بەرەو باشتر لە دوای گۆڕانكاری پۆزەتیف لە ئاڕاستەو بیروڕاو بەهاو ڕەفتاری خۆیدا، هەروە ها پێویستە خوێندكار لە پەیوەندییە كۆمەڵایەتیو پیشەییەكەی خۆیدا لەناو زانكۆ سەركەوتووبێت، بۆ ئەوەی بەربەستەكان دوای نەخەن لە ڕەوتی زانستیو گەیشتن بە ئامانجەكەی، پێویستە خوێندكار پێش چوونە زانكۆ، زانكۆ بناسێت، بۆ نموونە چ سیستەمێ كاری پێدەكرێ لە زانكۆ، بەشو كۆلێژەكانی زانكۆ، بەشە كارگێڕییەكانی، پلەی زانستیو ئەو چەمكانەی زۆر دووبارە دەكرێنەوە لە ڕۆژانەدا، وەكو (زانكۆ- كولێژ- بەش- سەرۆكی زانكۆ- ڕاگر- سەرۆك بەش- كاروباری خوێندكاران- توێژینەوەی زانستی- مامۆستای یاریدەدەر-

پرۆفیسۆر- بەکالوریوس- پلەی شەرەف- دراساتی خوێندنی باڵا- تۆمار- وەرزی خوێندن- یەکەکانی خوێندن-... هتد).

**- دەبێت خوێندکار چۆن پلان دابنێت تا زانکۆ ببێتە بە پیترین قۆناغی ژیانی؟**

* دەبێت خوێندکار پلان دابنێت بۆ ئەم قۆناغە گرنگەی ژیانی، بە جۆرێک کە بە پێزترینو بەرهەمدارترین قۆناغی ژیانی بێت، چونکە ئایندەی دیاری دەکات، کەواتە دەبێت بزانێت سروشتی ئەو کارە چییە کە دەیەوێت لە ئایندەدا ئەنجامی بدات، بوارەکانی خوێندن چین کە پێتدەگەنێتو ئامادەت دەکات بۆ ئەو کارە، رۆڵی زانکۆ چییە لە ئایندەی تۆدا، ئەوانە چین کە لەسەر پلانی ئایندەی خوێندکار کاریگەرییان هەیە، حەزو ئامانجی چییە لە ژیاندا، بەهای کار لای چەندە، ئەگەر بەهاو نرخی کاری خۆمان ناسی، دەبێتە بەدەستهێنانی رەزامەندی خود، رێزگرتن لە کاتو چاوبڕینە ئامانجو سودوەرگرتن لە عەقڵە زانستییەکانو خوێندنی وانەکان، زۆر گرنگە بۆ خوێندکاری زانکۆ، چونکە هەرگیز ئەو دەرفەتەی فێربوونی بۆ نارەخسێ لە ژیاندا.

**- لەوانەیە هەندێک لە خوێندکاران بەم گۆڕانکارییە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر، تووشی هەندێك گرفت ببن، ئەمە تا چەند سروشتییەو چۆن چارەسەر دەکرێت؟**

* تاك، یان کۆمەڵگە لە کاتی گۆڕانی قۆناغی ژیانیدا ڕووبەڕوی چەند گرفتێك دەبێتەوە (دەروونی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، ...هتد)، کە زۆرجار بێ توانا دەبێت لە رووبەڕووبونەوەیانداو کاردەکاتە سەر رۆڵو ئەرکەکەی لە ژیانی کۆمەڵایەتیو فێرکاری خۆیدا، بەتایبەتی لەو کێشانە (هەست نەکردن بە ژینگەی زانکۆیی، نەبوونی هۆکارەکانی ئاسودەییو حەوانەوە، بوونی مەحسوبییەتو مەنسوبیەت لە مامەڵەدا- کەمی هاوکاری نێوان خوێندکاران – جیاوازی رەگەز- تیکەڵاوی، جیاوازی چینایەتی، فراوانبوونی پەیوەندییەکانی، چونکە لە زانکۆدا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان سنوری خێزانو دراوسێو گەرەك ...هتد، تێدەپەڕێنێت)، دەبێت خوێندکار بزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییە تازانەدا بکات، تاکو سنورەکان بپارێزێتو گرفتار نەبێت بە هۆیانەوە، بێگومان گرفت لە ژیانی زانکۆ ڕوودەدات، بەڵام گرنگ ژیرانە مامەڵەکردنە لەگەڵ کێشەکانو چارەسەرکردنیانە، بە پشتبەستن بەخودی خوێندکارو خێزانەکەیو کەسی پسپۆڕو دڵسۆز، نەك شاردنەوەو داپۆشینی کێشەکان.

**- دەبێت پەیامو ئامانجی خوێندکار چۆن بێتو چی بکات بۆ گەیاندنیان؟**

* دەبێت خوێندکار پەیامو ئامانجو تێڕوانینی ڕوونو ئاشکرا بێت، تاکو کاربکات بۆ گەیاندنیانو بەدەستهێنانیان لە ژیانیدا، کە بریتییە لە: فراوانی دنیابینیو ئاسۆی بیری، تاکو ببێتە تاکێکی کاراو بەرهەمدار لە کۆمەڵگەو کەسێکی سەرکەوتوو وردەکار لە پسپۆڕییەکەیدا، گەرەو گوری لە کارکردنو بەرهەمهێناندا، دەبێت گرنگی یەکەمی بە زانست بێت، دواتر لایەنەکانی تر، چونکە رەوشتو زانستو کارکردن پێکەوە راپەرین بەرپادەکەنو گۆڕان بەسەر تەواوی ژیاندا دەهێنن.




# زاراوەی کارگێڕی

ئا: وەهاب حەسیب محەمەد

**کاتگێڕی کات:-** کات، یەکێکە لە گرنگترین توخمەکانی بەڕێوەبردن، بەخێرایی دەگۆڕدرێت، بێئەوەی بتوانین پێشی بکەوین، یان هەڵیبگرین، لێرەدا توانای سەرکردە، لە شیکاریو زانینی کاتدا دەردەکەوێت، چۆنو کەی؟ سەرکردە لەگەڵ کێدا کاتەکانی بەسەر دەبات. لێرەوە بابەتە گرنگەکانو ئەو کەسانە دیاری دەکات، کێو کامیان زۆرترین کاتی بۆ تەرخان دەکات، هەر سەرکردەیەك لە بواری کاتگێڕیدا سەرکەوتوو نەبێت، هیچ کارێکی دیکەی پێ بەڕێوە ناچێت.

**کاتگێڕی واتە:** بەکارهێنانی کات، بەشێوەیەکی نموونەیی، لە بەرنامەڕێژیی کاتو تەواوکردنی کارەکان، بەپێی پلانێکی نەخشە بۆدارێژراو، وەها لێکدانەوەیەك. لەلایەك پێویستی بەفیڕۆنەدانی کاتە، لە لایەکی دیکەوە، پێویستی بەدانانی نەخشەی رۆژانە، هەفتانە، مانگانەو ساڵانەیە، کە بەڕێوەبەر ئەرکو پێویستیی رۆژانەی تێدا تەواو بکات، هەروەها نەخشە بۆ کارەکانی داهاتوو دابڕێژێت، تا ئەو کاتەی لەبەر دەستیدایە بەفیڕۆ نەڕوات، لە ئەنجامی کەڵك وەرنەگرتن لە کاتو تەواونەکردنی کارەکانەوە، فشاری کار درووست دەبێتو ماندووبوونو بێزاری لێدەکەوێتەوە، تاقیکردنەوەکان دەریانخستووە، کە زیادەڕۆیی لە بەکارهێنانی کاتدا، کۆششێکی زۆری دەوێت، فشارو ماندوویێتیی زیاتر درووست دەکات، لەوانە زۆری کۆبوونەوەو گفتوگۆکردن، زیاد مانەوە لە نووسینگەی کاردا (دانیشتن لەسەر کورسی)، ئەم کارانەش کۆششێکی جەستەیی زۆریان پێویستە، هەروەها هۆکارن بۆ نائارامیو شڵەژانی جەستەیی، کە گریمانەی زۆر نەخۆشی، وەکو: شەکرە، سوتانەوەی گەدەو ... تاد، لێدەکرێت.

**هۆکارەکانی بەفیڕۆدانی کات:-**

١- نارۆشنی لە تەواوکردنی ئەو ئامانجەی، کە تاك دەیەوێت بەدەستی بهێنێت.

٢- هەڵسان بە پیادەکردنی کارە رۆتینەکان، کە بەردەستان دەتوانن تەواوی بکەن.

٣- پیادەکردنی ئارەزووەکان، لەسەر حسابی ئەرکەکان.

٤- خراپ رێکخستنو پاراستنی کاغەزو دۆسیەو دەفتەری تۆمارەکان.

٥- دزەکانی کات، ئەوانەی پێشوەختو دوور لەهەر پێویستییەك سەردانی نووسینگە (نووسینگەی بەڕێوەبەر) دەکەن.

٦- گردبوونەوەی کارو دواخستنی بڕیارەکان بە هۆی دواخستنیان.



# کارتی بەکارهێنانی هاوسەنگی کارتی بە جێگەیاندنی ئەرکەکان

یونس محەممەد خەزنەیی

پێویستی بەکارهێنانی هاوسەنگی، کارتی بە جێگەیاندنی ئەرکەکان، بۆ پێوانی کاریگەری پرۆگرامی دامەزراوە حکومییەکان بۆ ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان

**ڕێخۆشکردن:-**

هەرچەندە لە زانکۆدا، پسپۆڕییەکەم هیچ پەیوەندییەکی بە کارگێڕیو بەڕێوەبردنەوە نەبوو، بەڵام بە ئەزموونی مامۆستاییەو بەدەستەوەگرتنی چەند پۆستێکی ئیداریی جیاواز، تێبینیم کرد نەبوونی زانیاری، سەبارەت بە کارگێڕیو بەڕێوەبردن، زیانێکی زۆر لە تاکەکان دەدات، لە بە جێگەیاندنی ئەرکەکانیاندا، چەندان بابەتم لەو بارەیەوە خوێندەوە، تا بە سەرەتایەکی ئەو زانستە ئاشنا ببم.

ساڵی ٢٠٠٩ ڕێکخراوی فریاگوزاریی نەرویجی، خانەی زانستی مەدەنی، کۆرسێکی خوێندنی تایبەتیان ڕاگەیاندو منیش بەشداریم کرد، پاشان چووم بۆ بەشی کارگێڕیی دامەزراوەکان، دەتوانم بڵێم: دەروازەی هەموو بەشەکانی ئەو زانستەمان، بە چڕوپڕی خوێند. تا ساڵی ٢٠١١ چومە مالیزیا، بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لە پسپۆڕییەکەی خۆمدا، کە زانستی فیزیا بوو، بەڵام زۆر بە وردی لە سیستەمی بەڕێوەبردنی دامەزراوەکانی ئەو وڵاتە ورد دەبوومەوە، بە تایبەتی ئەو بەشانەی، کە ئێمە بەردەوام هاتووچۆمان دەکردن، لە ناو زانکۆدا، لە هەموو ئەو شوێنانەدا چەند تابلۆیەك هەڵواسرابوو، کە نەخشەی پلانی ستراتیجیی زانکۆو بەشەکەی لە خۆ دەگرت، بەڵام لەبەر نەبوونی دەرفەت، نەپەرژام بۆ پرسیارکردنو کۆکردنەوەی زانیاری لەسەری، تا خودا دەرفەتی داو گەڕامەوە بۆ تەواوکردنی دکتۆرا لە هەمان زانکۆدا. بە ئاشنابوونو بەشداریکردنم

لە بۆردی بەڕێوەبردنی سەنتەری گەشەپێدانی پەیوەندیی ڕێبەرە زانستییەکان، کە سەنتەرێکی گەشەپێدانی سەر بە زانکۆ بوو، لە خولەکانیاندا زۆر بە وردی تیشکیان خستە سەر چۆنێتیی دانانو بەکارهێنانی نەخشەی ستراتیژیو کارتی بەجێگەیاندنی ئەرکەکان. کە بابەتێکی زۆر گرنگە، ئێستا لە جیهاندا، چەندان دامەزراوەو زانکۆی گەورە، لە دانانی پلانی ستراتیژییاندا، بەکاری دەهێنن. هەروەها ئەم ڕێگەیە، زۆر بەسەرکەوتوویی، لە چەندان شاری جیهاندا بەکارهێنراوە. وەك: شاری شارلوت لە باکوری ویلایەتی کارۆلینا، شاری بریسبان لە ئوسترالیا، شاری ڤانکۆڤەر لە کەنەدا.

لەبەرئەوە بە پێویستم زانی، ئەم بابەتە بە کوردی بخەمە بەردەستی خوێنەرانی خۆشەویست، بەو هیوایەی بتوانرێت لە دامەزراوەکانی خۆماندا سوودی لێوەربگیرێت.

**هاوسەنگیی کارتی بە جێگەیاندنی ئەرکەکان چییە؟**

هاوسەنگیی کارتی پێوانی بە جێگەیاندنی ئەرکەکان، بریتییە لە: ئامرازێك لە ئامرازەکانی پلانی ستراتیژیو سیستەمی بەڕێوەبردن، کە زۆر بە چڕی، لە بازرگانیو پیشەسازیو حکومەتو دامەزراوە قازانج نەویستەکاندا، لە هەموو جیهاندا، بە کاردەهێنریت؛ بۆ یارمەتیدانی دامەزراوەکان، لە دانانی نیشاندەر، بۆ پێوانی ڕادەی جێبەجێکردنی ئامانجە ستراتیژییەکان، بۆ بەدیهێنانی دیدی دامەزراوەکە.

**سوودەکانی بەکارهێنانی هاوسەنگیی کارتی بە جێگەیاندنی ئەرکەکان:-**

١- پێکەوەگرێدانی دیدو پەیامو ستراتیژی دامەزراوەکە، لەگەڵ ئامانجە وەگەڕخراوەکانیدا.

٢- ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکان بە شێوەیەکی خێراو کاریگەر.

٣- چاککردنی توانای دامەزراوەکە لە میانەی درووستکردنی

هەماهەنگی لە نێوان بەشە جیاوازەکانیدا.

٤- بەدواداچوونی بەردەوام بۆ بەدەستهاتووان.

٥- نەرمی نواندن؛ لە بە دەمەوەچوونی خێرا، بۆ چاکسازی.

٦- دیاریکردنێکی ڕوون و ئاشکرای بەرپرسیاریەتییەکان و ئەرکەکان، لەنێوان ئەندامانی گروپی کاردا.

٧- شیکارو پێوانی کارو چالاکییە بنەڕەتییەکان.

٨- بە تەنها پشت نەبەستن بە ئەنجامە داراییەکان، بۆ پێوانی بە جێگەیاندن؛ چوونکە تەنها خاڵ نییە، بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتنی ڕاستەقینەی دامەزراوەکە.

## هەنگاوەکانی نەخشەسازی، لە کارتی پێوانی بەجێگەیاندنی ئەرکەکاندا، بۆ پرۆگرامی دامەزراوەکان:-

### یەکەم: دیدو پەیام:-

پێویستە هەر دامەزراوەیەك، لەبەر ڕۆشنایی ئەو بیرو بۆچوونەی کە هەڵیگرتووە، دیدو پەیامی خۆی دابڕێژێت. دید بریتییە لەو ئاراستەو بۆچوونەی کە دامەزراوەکەی بۆ بنیاتنراوە، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بەدی بهێنێت، پێویستە زۆر ڕوون و نیگا بەخش بێت.

بەڵام پەیام بریتییە لە: دەربڕینێك لە ڕستەیەکدا، هۆی درووستبوونی دامەزراوەکە ڕوون دەکاتەوە، کە سەرەنجامی دیدی دامەزراوەکەیە، پەیوەستە بە وەڵامی پرسیارە پێشوەختەکان، کە دەکرێت سەبارەت بە دامەزراوەکە (شێوازی کارکردن؟ بۆچی؟ لە کوێ؟ کەی؟ چۆن؟)، پەیام چەند ڕەگەزێکە پێویستە ڕوون و ئاشکرا بێت، وەك فەلسەفەی دامەزراوەکە (بەها، ڕەوشت، بەرزی داخوازییەکان، سوودمەندان، خزمەتگوزاریی و ئەو بەرهەمانەی کە پێشکەشی دەکات، شوێنی کارکردنی، تایبەتمەندییەکانی، مەودای بەدیهێنانی داخوازی شوێنکەوتوانی).

### دووەم: شیکاری خاوەن بەرژەوەندییەکان:-

پاش دارشتنی دیدو پەیامی دامەزراوەکە، پێویستە شیکاری خاوەن بەرژەوەندییەکان بکرێت، لە خشتەیەکی هاوشێوەی ئەمەی خوارەوەدا، ڕێکبخرێت و هەموو ئەو دەستە و تاقمانە دیاری بکرێن، کە بەرژەوەندییان لەگەڵ دامەزراوەکەدا هەیە. بۆ نموونە کۆمەڵگا، ڕاگەیاندنەکان، کارمەندانی دامەزراوەکە... هتد.

### سێیەم:- ڕێکخستنی ڕیزبەندی کارتی پێوانکاری:-

لە کارتی بە جێگەیاندنی ئەرکەکاندا چوار تەوەری سەرەکی هەیە، پێویستە هەموو دامەزراوەیەك نەخشەی ستراتیژیی خۆی لەسەر دابڕێژێت، ئەوانیش بریتین لە: تەوەری کڕیارەکان، فێربوون و گەشەپێدان، کرداره ناوخۆییەکان، دارایی. بەپێی سروشتی دامەزراوەکە، ڕیزبەندی بۆ تەوەرەکان دادەنرێت، کام تەوەر گرنگی زیاتری پێدەدرێت، کامیان کەمتر، بەڵام نابێت هیچ کامیان فەرامۆش بکرێت.

### چوارەم: دیاریکردنی ئامانجە ستراتیژییەکان:-

پاش ڕێکخستن و ڕیزبەندیی کارتی بەجێگەیاندنی ئەرکەکان، بە لە بەرچاوگرتنی شیکاری خاوەن بەرژەوەندییەکانی دامەزراوەکە و جێبەجێکردنی شیکاری خاڵی بەهێزو لاوازو دەرفەت و مەترسییەکان، ئامانجە ستراتیژییەکانی دامەزراوەکە دیاری دەکرێت و لە خشتەیەکی وەك ئەمەی خوارەوەدا ڕێکدەخرێت.




### پێنجەم: نەخشە ستراتیژییەکە:-

پاش دیاریکردنی ئامانجە ستراتیژییەکە، دەتوانرێت بەئاسانی نەخشە ستراتیژییەکە درووست بکرێت، بە دانانی هەموو ئامانجەکان بەرامبەر تەوەرەکانی کڕیارەکان، فێربوون و گەشەپێدان، کرداره ناوخۆییەکان، دارایی.

### شەشەم: دانانی پیشاندەری پێوانی بە جێگەیاندن:-

بۆ هەر ئامانجێك پیشاندەری پێوانی بە جێگەیاندن دادەنرێت، کە لێرەوە گرنگی ئەم ئامرازەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە بەدواداچوون بۆ بە جێگەیاندنی ئەرکەکان، زۆر ئاسانەو دەتوانرێت بڕیار بدرێت، تا چەند دامەزراوەکە سەرکەوتوو بووە؛ لە بە دیهێنانی ئامانجەکەیدا. بۆ نموونە: دامەزراوەیەك یەکێك لە ئامانجەکانی، لە تەوەرەی فێربوون و گەشەپێداندا بریتییە لە: بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاریی کارمەندان، لە بەشێکی دیاریکراوی دامەزراوەکەو لە بوارێکی دیاریکراودا، پێویستە چەند نیشاندەرێکی هەبێت بۆ پێوانی ڕێژەی بەجێگەیاندنی ئەو ئامانجە، وەك: کردنەوەی خولی گەشەپێدان و ڕاهێنان لە بابەتێکدا بۆ ١٥ فەرمانبەر. هەروەها بۆ ئامانجەکانی تریش، بە هەمان شێوە.

### دیاریکردنی دەستپێشخەرییە زیرەکەکان:-

لە کۆتا هەنگاودا، پێویستە بۆ هەموو تەوەرو ئامانج و نیشاندەرەکان، دەستپێشخەرییە زیرەکەکان دیاری بکرێت، کە زۆر بەوردی کاتی چالاکییەکان دیاری بکرێت و دابەش بکرێت بەسەر ساڵ و مانگ و هەفتەدا. پاشان لەگەڵ نزیکبوونەوەی چالاکییەکەدا، ڕۆژو کاتژمێری جێبەجێکردن دابنرێت.

بەمەش دامەزراوەکە، ڕزگاری دەبێت لەوەی کە چالاکییەکانی تەنها لە خزمەتی تەوەرێك، یان ئامانجێکدا لە بەشێکی دیاریکراودا، چەقبەستوو بێت. بەڵکو بەشێوەیەکی هاوسەنگ، سوود بە سەرجەم تەوەرەو بەشەکانی دیکە، دەگەیەنێت.

### ئەنجام:-

دوای دانانی نەخشە ستراتیژییەکە بۆ هەر دامەزراوەیەك، جا دامەزراوەکە کەرتی گشتی، یان تایبەت بێت، قازانجویست، یان قازانجنەویست بێت. پێویستە ئەو نەخشەیە لە هەموو ژوورێکی دامەزراوەکەدا هەڵبواسرێت؛ ئەو کات هەر بەشەو دەزانێت کاری ڕۆژانەو هەفتانەو مانگانەی چییەو چەندی جێبەجێکراوەو چەندی جێبەجێنەکراوە. کەسی کەمتەرخەم دەردەکەوێت و دەزانرێت چ هۆکاری بەدی نەهاتنی ئامانجی دامەزراوەکەیە.

لەبەرئەوە بۆ دامەزراوەکانی ئێستای حکومەتی هەرێم، زۆر پێویستە ئەم شێوازە لە پلانداندا جێبەجێبکرێت و هەموو تاکەکانمان بەردەوام گلەیی نەکەن و دیاریش نییە؛ کێ دڵسۆزەو کێ کەمتەرخەمە.

# نووسینگەکەت، خاوێن ڕابگرە..

یەکەمین سەلیقەو لێهاتوویی، کە پێویستە بەڕێوەبەر، بەباشی بیزانێت، بریتییە لە: خاوێنڕاگرتنو ڕێکخستنی نووسینگەکەی. سەلیقەی خاوێنڕاگرتنی نووسینگە، تەنها سەلیقەیە، کە پێش ڕێکخستنو بەڕێوەبردنی کات دەکەوێت، بگرە لەویش گرنگترە.. چونکە کاتێك، سەرمێزو نووسینگەکەت، ڕێك دەخەیت، ئەوا بەم کارەت، هەم خۆت، هەم کاتو هەم کارمەندەکانیشت، ڕێکخستووە.

## گرفتەکانی نووسینگەی پەڕپووت:-

هەر کاغەزو نووسراوێکی زیادە، کە لەسەر مێزەکەتە، ڕۆژانە پێنج جار، بیرو هۆشت پەرتو پەرێشان دەکەن.

نووسینگەی جەنجاڵو قەرەباڵغ، ئەوە دەگەیەنێت، کە: کاتژمێرەکانی کارکردن زۆرترن، دەستکەوتو ئەنجامەکان کەمترن، کارەکان دوا دەکەون، نووسراوەکان ون دەبن، بیرو زەینت جەم نین، ئەرکەکان ناسپێردرێنو گوشارەکان زۆرتر دەبن. هەروەها ئەو نووسینگەیەی تێکچڕژاوە بەسەریەکدا، لە ڕووی تەندرووستیشەوە، ئاکامی مەترسیداری هەیە.

## چەند هەنگاوێك، بۆ خاوێنڕاگرتنی نووسینگە:-

- هەڵمەت ببەرە سەر کۆماو کەڵەکەی کاغەزو نووسراوەکانو هەموو ئەو کارانەی پێویستیان بە بڕیارلێدانە، ڕابپەڕێنە.
- گشت ئەو کاغەزو نووسراوانەی هی کەسانی دیکەن، گلیان مەدەرەوەو یەکسەر بیاننێرە بۆ بەشەکانیان.
- سەرجەم ئەو نووسراوانەی شیاوی هەڵگرتنن، بیانپارێزە.
- تێکڕای ئەو نووسراوانەی شیاوی هەڵگرتن نین، فڕێیان بدە.
- لە هەموو ڕۆژژمێرە دووبارەکان، خۆت ڕزگار بکەو ئامرازە پەرتو بڵاوەکانی نووسینگەکەت، ڕێکبخە.
- دەفتەر، یاخود فایلبۆکسی هاتوو و ڕۆیشتوو، لەسەر مێزەکەت دوور بخەرەوە.
- سەرجەم سەرچاوەو ڕێبەرەکانی ڕێوشوێنی کار، لە ڕەفەکاندا دابنێ.
- ئەوە بە هەمووان ڕابگەیەنە، کە نووسینگەکەت، ناوچەیەکی لە کاغەزو نووسراو داماڵراوە.

## جێبەجێکردن:-

ئەم بیرۆکە سادەیە، لە کتێبێکدا خوێندومەتەوە، کە هەمان ناونیشانی « نووسینگەکەت خاوێن ڕابگرە»ی هەبوو، ژیانو شێوازی کاری منی گۆڕی. بیرۆکەکەش، هەر هێندەی دەوێت، کە وەهای دابنێیت، نووسینگەکەت بە شێوەی ئەم سێ ئاستە، بەکار بهێنیت. ئەوانیش:-

ئاستی یەکەم:- ڕووی مێزەکەتە؛ کە لەسەری دەنووسیتو کاری لەسەر دەکەیت. لەسەر ڕووی ئەم مێزە، بێجگە لە: ڕۆژژمێر، قەڵەم، کۆمپیوتەرو ئەو پڕۆژەیەی ئێستە کاری تێدا دەکەیت، هیچی دیکە مەهێڵەرەوە.

ئاستی دووەم:- بریتییە لە دۆسییەی هەفتانە، ئەم دۆسیەیە، یان ئەم ڕەفەیە، یان ئەم چەکمەجەیە، دەبێت دوور بێت، لە مێزەکەتەوە، بە جۆرێك بە هەستان لەسەر کورسییەکەت نەبێت، دەستت پێی نەگات. ئەمەش وا دەکات هەرچییەك هەبوو، یان هاتە پێش، لەو دۆسیەیەدا، داینەنێیت.

لەم ئاستەدا، کارەکانی هەفتەکە، بەپێی ڕۆژەکانی هەفتە، ڕیز بکە.

ئاستی سێیەم:- بریتییە لە: ئەرشیف، یاخود سیستەمو شیرازەی هەڵگرتنی نووسراوو دۆسییەکان. پێویستە ئەمە، لە دەرەوەی نووسینگەکەت بێت، چونکە تێیدا، فایلو نووسراوو دۆسییەکان، بۆ ماوەو مەودایەکی دوور، دەپارێزیت.

نەسیم سەمادی



# چۆن هاوڕێ بەدەست دەهێنیت؟



ئا: محەممەد مێرگەیی

هەبوونی هاوڕێی باش لە منداڵیدا، ژیانمان جوانتر دەکاتو سوودمان پێدەبەخشێت. هەندێجار هەست دەکەیت پێویستت بەوەیە، هاوڕێت هەبێت، بۆئەوەی گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەیت، یان یاری جۆراوجۆریان لەگەڵدا بکەیت، یان پێکەوە پیاسە بکەنو کاتێکی خۆش بەسەرببەن، سەعی بکەن، یاخود تەنانەت لە تەلەفۆنەوە قسەبکەنو بە یەکەوە بدوێن.

کاتێکی زیاتر لەگەڵ هاوتەمەنەکانت بەسەرببە:- ئەگەر دەتەوێت هاوڕێ بەدەست بهێنیت، دەبێت یەکەم جار، لە شوێنو جێگەیەکدا لە نێوانیاندا بیت، بۆئەوەی بتوانیت، چاوت پێیان بکەوێتو بیانناسیت.

بەشداریی بکە لە گروپێك، یان تیمێك کە منداڵانی وەکو تۆی تێدابێتو هەمان خولیای تۆیان هەبێت، وەك ئەنجامدانی وەرزشێك، یان نیگارکێشان، یان فێربوونی زمانێك... هتد.

جەختکردن لەسەر سیفەتی باشو باوەڕبەخۆبوون:-

هاوڕێکانت بە وردی هەڵبژێرە، ئینجا بۆت بەدەردەکەوێت، کە هاوڕێیەتیکردنی هەندێکیان، لە هەندێکی دیکە ئاسانترە. جەخت بکەرە سەر سیفەتە باشەکانتو باوەڕت بەخۆت هەبێت، هەندێك لەوانەی کەمتر باوەڕیان بە خۆیان هەیە، دوودڵو ڕارا دەبن لە دەستپێکردنی هەر قسەو گفتوگۆیەکدا. باوەڕت بەخۆت هەبێتو قسە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بکە. دەبێت لە هەموو بارێکدا، یارمەتی هاوڕێیەکەت بدەیت، هەرگیز گاڵتەی پێمەکە، ئەگەر کەسێکیش لە بەرامبەرتدا، گاڵتەی پێکرد، ئەوا تۆ یارمەتی بدە.

بڕۆرە ناو تیمێکی وەرزشیی:- ئەمە بەدەستهێنانی هاوڕێت بۆ ئاسان دەکات، هەروەها بەشداربوونت لە هەر چالاکییەکی دیکەدا، هەمان ئەم ئامانجەت بۆ بەدی دەهێنێت.

* خۆبەخشبە:-

کاری خۆبەخشیی، هۆکارێکی زۆرباشە، بۆ ناسینی خەڵكو بەدەستهێنانی هاوڕێیەتییان، بۆ نموونە: خۆبەخشیی لە گروپێکی پاراستنی ژینگەدا، یان بۆ جوانکردنی ئەو ناوچەیەی، تۆی تێدا دەژیت؛ بە چاندنی نەمامو دارودرەخت، ئەمە دەرفەتێکت پێ دەدات بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکییە، لەگەڵ هاوەڵانتداو ئەمەش دەبێت بە مایەی دروستبوونی پەیوەندییو هاورێیەتی لە نێوان تۆو ئەواندا.

سەیری نێو چاوەکانی خەڵك بکەو بە زەردەخەنەوە گفتوگۆیان لەگەڵدا بکە:- ئەگەر بە نێوچەوانی گرژو بەبێزارییەوە تەماشای خەڵك بکەیت، ئەوا خەڵکیش لێت دوور دەکەونەوەو ئارەزووی هاوڕێیەتیت ناکەن.

دڵسۆزو جێی باوەڕو متمانەبە:-

بۆ هاوڕێت دڵسۆز بە، چونکە بەشێکی هاوڕێیەتی، بریتییە لە: ئامادەیی تۆ، بۆ قوربانیدان بە کاتتو ماندووبوونت لە پێناو هاوڕێیەکەتدا. هەر کە بوویت بە هاوڕێی کەسێك، بە باشترین شێوە، ئەرکەکانی هاوڕێیەتی بەجێ بهێنە لە بەرامبەریدا، بۆ نموونە: لەبەر ئەوە، هەندێك چالاکی ئەنجام بدەو پرسیاری لێبکە هەست بە چی دەکات.

جێی متمانەبە، ئەگەر کاتێکتان دەستنیشان کرد، بۆ چاوپێکەوتنی یەکدی، تۆ درەنگ مەکەوەو ئەگەر لەبەر هەر هۆیەکیش، نەتتوانی لە کاتی دیاریکراودا چاوت پێی بکەوێت، ئەوا پێی ڕابگەیەنەو داوای لێبووردن بکەو کاتێکی دی دیاری بکەن. ئەگەر بەڵێنی هەر شتو کارێکت بە هاوڕێکەت دا، ئەوا بەڵێنەکەت ببە سەرو جێبەجێی بکە، چونکە خەڵکی، ئەو کەسانەیان خۆشدەوێت، کە باوەڕو متمانەیان پێدەکەن.

گوێگرێکی باشو پارێزەری نهێنییەکان بە:-

گوێگرێکی باش بە، بۆ بەدەستهێنانی هاوڕێیەتی کەسانی دیکە، پێویستە بە بایەخەوە گوێ لە هەموو ئەو قسەو وتانە بگریت، کە پێت دەڵێن، قسە گرنگەکانی ئەوانت لەیادبێت، وەکو ناوەکانیانو ئەو شتەی حەزی لێدەکەنو ئەوەی ئارەزووی لێناکەن، هەروەها پرسیاریان لێبکە، لەبارەی ئەو شتانەی بە لایانەوە گرنگن لە گشت بوارەکاندا.

لە کۆتایی گفتوگۆکەتانەوە، خۆت بناسێنە، ئەمە زۆر ئاسانەو تەنها بە ناساندنی خۆت کەسی بەرامبەریش، هەمان ئەو کردارەی تۆ ئەنجام دەدات، دەبێت بە باشی ناوەکەیت لەیاد بمێنێت، چونکە ئەمە، وای لێدەکات هەست بەوە بکات، ئەگەر بۆ جارێکی دی، چاوت پێی بکەوێتەوە، ئەوا تۆ بەباشی گوێی لێدەگریت. ئەمەش هانی دەدات زیاتر ئارەزووی هاورێیەتیی تۆ بکات.

* سەرەتای قسەکردنو گفتوگۆی باش:-

با قسەکردنەکە کورتو پوخت بێت، بەپێی قسەی هەندێ لە شارەزایانی بواری گفتوگۆو پەیوەندی نێوان خەڵکی، یاسای زێڕین لە گفتوگۆو قسەکردندا، ئەوەیە، کە باشتر وایە بۆ مرۆڤ لەکاتی گفتوگۆی کورتدا، یاسای ٣٠-٧٠ پەیڕەو بکات، واتە (٣٠٪ قسەکردنو ٧٠٪ گوێگرتن).

سەرچاوە: گۆڤاری ماجد، ژمارە ١٨٤٢، ساڵی ٢٠١٤.



# هونەری فرۆشتن

وەهاب حەسیب

هەمـــوو بەرهـــەمو خزمەتگوزارییـــەك، کـــە لەبـــازاڕدا دابیندەکرێتو دەخرێنەڕوو بۆ کڕیارە، بە واتایەکی تر کڕیار ســـەروەری بـــازاڕە، بەتایبەت لە ڕۆژگاری ئەمـــڕۆدا، کە یەك بەرهەم لەلایەن چەندین ناوەندی بەرهەمهێنانەوە لە بازاڕدا پیشـــان دەدرێنو دەخرێنە ڕوو، ساغکردنەوەی بەرهەمەکانو درووســـتکردنی متمانـــە لای کڕیـــار، ســـەرەڕای بانگەشـــەو ڕاگەیاندن، پێویســـتی بە هونەرێکە، کە بە هونەری فرۆشـــتن ناودەبرێت.

فرۆشـــتن:- کارێکـــە، پـــاڵ بـــە کڕیـــارەوە دەنێـــت بـــۆ بەدەســـتهێنانی بەهەرمێك، یان توانایەکە، بە تاقیکردنەوەو ئەزموون، ڕووپۆش ئەکرێت.. بەڕاهێنانو بەردەوامی، بەدەست دەهێنرێت (فێری دەبین).

کڕیـــار:- کەســـێك، یـــان لایەنێکـــە (وەك کۆمپانیایـــەك، کارگەیـــەك، بازرگانێـــكو بەکاربەرێك)، پێویســـتییەکانی لە بازاڕدا، بە مەبەستی قازانج، بەکارهێنانو... هتد، دابین دەکات.

هونەری فرۆشـــتن، بە چەند هەنگاوێك دەســـت پێدەکات لەوانە:

ئامادەکاری بۆ فرۆشتن:-

١- لێکۆڵینـــەوە لـــە کڕیـــارە چاوەڕوانکـــراوەکان:- کڕیار خاوەنی بڕیارو سەروەری بازاڕە، بەتایبەت ئەگەر ڕکابەری لە نێوان خاوەن بەرهەمو فرۆشیارەکاندا هەبوو، یان ڕکابەرییەکە توندبوو، لێرەدا پێویستە ئەم ڕاستیانە بزانین:

* بۆچی کڕیار پێداویستییەکانی دەکڕێت؟

کڕیار کاتێك دابینکردنی پێویســـتییەکانی لە بەرهەمێکی دیاریکـــراودا دەبینێتـــەوە، بـــاوەڕی وایە دواتـــر ئەنجامێکی باش، تایبەتمەندی، کەڵکو خزمەتگوزاری لەو پێویســـتیانەدا دەبینێتـــەوە، کەواتـــە: گـــەڕان بـــەدوای کڕیـــاردا، یەکێکە لە هونەرەکانی فرۆشتنو لەم پرسیارانە پێکدێت:-

أ- کڕیار کێیە؟

ب- لـــە چ بازاڕێـــك فرۆشـــیار کڕیارەکانـــی ببینێتـــەوەو

دەستنیشانیان بکات، بۆ نموونە: چەندین کۆمپانیا کە لەبواری جوانکاری ئافرەتاندا بەرهەمهێنن، بەرهەمەکانیان بۆ خانمانێك بەرهەم دەهێنن، کە لەتەمەنێکی دیاریکراودان، وەك لە سەرووی سی ساڵییەوە، بەم شێوەیە بەشێك لەبازاڕیان کردووە بەئامانج).

ج- کێ خاوەن بڕیارە؟ بۆ نموونە لە خانەوادەی ڕۆژهەڵاتیدا زۆربەی کات، باوك ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت، بەڵام لە ڕۆژئاوادا دایك ڕۆڵی سەرەکی هەیە، لە کڕینی پێویستییەکانی خێزاندا، هەروەها لە کۆمپانیاو دامەزراوەکانیشدا، شێوەکە تەواو جیاوازەو دەگۆڕێت».

د- باری دارایی، چونکە ئاستی داهات، کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر کڕیارو تێڕوانینەکانی دیاری دەکات لەبازاڕدا.

هـ- باشترین دەستپێك لەگەڵ کڕیاردا؟

و- کڕیار چ پێویستییەکی بەخزمەتگوزارییەکانمە؟

هەرکات خاوەن بەرهەم، یان فرۆشیار، ئەم وەڵامانەی دەست بکەوێت، دەتوانێت سەرنجی کڕیار بەلای بەرهەمەو خزمەتگوزارییەکانیدا ڕابکێشێتو جێگای متمانەیان بێت.

* چی وا لە کڕیار دەکات گوێ بگرێت؟

کاتێك کڕیار هەست بکات، کە فرۆشیار ئاخێوەرێکی بەتوانایە، لەبەرژەوەندیی کڕیار دەئاخڤێتو وتووێژەکەی جێگای ڕەزامەندیی کڕیار بێت. ئەو کات کڕیار، بۆ فرۆشیار گوێ ڕادەدێرێت.

لەم قۆناغەدا پێویستە فرۆشیار، بیر لەم هەنگاوانە بکاتەوە:

أ- ئایا پێویستم بە کڕیارە؟ (ئەگەر وەڵامی پرسیارەکەی بە ئەرێنی بوو، دەبێت فرۆشیار بە دڵو بە گیان، گوێ ڕادێرێتو کەسێکی وشك نەبێت لەگەڵ بەرانبەردا).

ب- ژمارە تەلەفۆنی کڕیار؟

ج- دانانی کاتو شوێن بۆ چاوپێکەوتن؟

د- دڵنیابوون لەوەی لە چاوپێکەوتنەکەدا کەسێك، یان کەسانی خاوەن بڕیاری تیادایە.

هـ- واژۆکردنی گرێبەستەکە.

لەم هەنگاوەدا دیاریکردنی کڕیار بەهەڵە لە دەستنیشانکردنی کڕیارە چاوەڕوانکراوەکاندا، زەرەرێکە لە فرۆشیار دەکەوێت.

٢- پلاندانان بەمەبەستی کۆبونەوە:- لێرەدا پێویستە ئەم ڕاستییانە بزانین:-

* لابردنی بەربەست، یان ئاستەنگەکان لەگەڵ کڕیاردا، سوپاسی کڕیارو پیرۆزبایی لێکردنی، چونکە بەرهەمەکەی ئێوەی هەڵبژاردووە، یان کڕیاری بەرهەمەکانتانە، بەهەمان شێوە باسی ناوبانگو مامەڵەی جوانی کڕیار لە بازاڕدا بۆ کڕیار بگێڕەوە. کۆی ئەم وتوێژە، پێویستە کەمتر لە سێ خولەکدا ئەنجام بدرێتو زمانپاراویی لە فرۆشیاردا ڕەنگ بداتەوە.

ئەو خاڵانە چین پێویستە وەبیریان بهێنیتەوە؟

* تایبەتمەندیو جیاکاری بەرهەمەکەت:- واتە ئەو تایبەتمەندییانەی کە بەرهەمەوخومەتگوزارییەکانت لە بەرهەمەو خزمەتگوزاریی ڕکابەرەکانت جیا دەکاتەوە، خزمەتگوزاریی دوای فرۆشتن (وەك گەیاندنی بەرهەمەکە بۆ ماڵ، یان نووسینگەی کڕیار بێبەرامبەر، وەرگرتنی نرخی بەرهەمەکان، بەچەند جارێكو...هتد)، زۆرکردنی ژمارەی کڕیارەکان، بانگەوازکردن بۆ بەرهەمەکە لەلایەن کڕیارەوە، واتە بەرهەمەو خزمەتگوزارییەکە بەجۆرێك متمانە لای کڕیار پەیدا بکات، بانگەواز بۆ بەرهەمەکە بکاتو لای کەسانی دیکە بەرهەمەکەت پەسەند بکات.

٣- زانینی تایبەتمەندی بەرهەمەکە؟

زانینی تایبەتمەندیو مەرجەکانی فرۆشتن، بەراوردکردنی بەرهەمەکە بە بەرهەمی ڕکابەران.

٤- خۆئامادەکردن؟

* واتە خۆسازکردنی کەسێتیو سیمای فرۆشیار لەبەرامبەر کڕیاردا، (بۆ نموونە پۆشینی جلوبەرگی گونجاو لەو بوارەو پەیوەست بەکارەکەتەوە، چونکە هەر کارێك پێویستی بە پۆشینی جلێکی تایبەتە، فرۆشیار تەنها بەرهەمەکانی نافرۆشێت، بەهاکانی، کەسێتیو سیماو... هتد، دەفرۆشێت، ئەو هۆکارانە ڕاستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر کڕیار هەیە).

* ڕێکخستنی جانتای کارو پێداویستییەکانی وەك: پەڕاوگە، چاپکراوەکان (ناسنامەی شوێنکارو...) دەفتەری گرێبەستەکانو تەواوکارییەکانی خۆئامادەکردن لە بواری فرۆشتندا.

* خۆئامادەکردن:- کاریگەری لەسەر کڕیار، تەنها بەچەند وتەیەکی جوان، یان شیرین نابێت، یاخود لەشێوەو ڕێکپۆشی فرۆشیار بەدەست ناهێنرێت، چونکە کڕیار لەگەڵ فرۆشیارێکدا ئاسوودەیە، کە لەڕێگای سیماو ڕەفتارەکانییەوە باوەڕی فرۆشیارەکە بەدەست بهێنێت، توێژینەوەکان لەم بوارەدا چەند بنەمایەکیان چەسپاندووە لەوانە:-

* ڕێکپۆشیو سیمای فرۆشیار.

* پۆشینی پۆشاکێکی گونجاو.

* وردەکاری بۆ کاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ کڕیاردا.

* دابینکردنی هۆکارەکانی فرۆشتن وەك:- بڵاوکراوەکان، نموونە:- پێدانی کڕیار بە نموونەیەك لەبەرهەمەکەو بەکارهێنانی بەهیوای درووستکردنی متمانە لای کڕیار، دواتر کڕینی بەرهەمەکەو "کارتی ناساندن" کارتێکە هەموو خەسڵەتو تایبەتمەندیی بەرهەمەکەی تێدا باس دەکرێتو ڕوون دەکرێتەوە.

سەرچاوە: www.abaha.co.uk

# چۆن دەتوانیت سامانەکەت زیاد بکەیت؟

نوسەر: حبیب جلیلیان
و: شکار عیزەت هەورامی

ڕێگای سەرکەوتنی هەر مرۆڤێك، لە ناخو دڵی خۆیدا گوزەردەکات، بەم دە ڕێگایە، سامانو دارایی کەمەندکێش بکەن بۆ لای خۆتان..

١- بزانن چیتان دەوێت؟ لەو شتەی کە دەتانەوێت دڵنیا ببنەوەو ئاگاداربن، زۆرێك لە ئێمە هێشتا نازانین، بەتەواوی لە ژیاندا، بە دوای چییەوەین.

٢- ئەو بڕە پارەیەی کە حەز دەکەن هەتان بێت، دیاری بکەن:- بۆ نموونە، حەزدەکەن (١٠) ملیۆن دینارتان هەبێت، بەم شێوەیە، زووتر دەگەن بە ئامانجەکەتان، تا ئەوەی بەس بە تەنها بڵێن: دەمەوێت پارەکانم زیاد ببێت.

٣- گوێ لە قسەی ناخو دەروونتان بگرن:- هەر ئەوشتەی کە لەناختانەوە دەیبیستن، گرنگی پێ بدەنو بە کردار جێبەجێی بکەن، بەداخەوە زۆربەمان باوەڕمان بەمە نییەو ڕەنگە ئێستا بە خۆتان بڵێن: (خۆ من هەرگیز باوەڕم بەم شتانە نییە، تەنانەت ناتوانم گوێم لەم ئیلهامەی ناخم بێت، (بەڵام ڕاستییەکەی ئەمەیە، ئەم ئیلهامانەو هێزی دەروونی بوونیان هەیە، بەمەرجێك خۆتان بتانەوێت، ڕێنموونی ئێوە دەکات، بەرەو ئەو شتەی کە دەتانەوێت.

٤- گەشە بدەن بە بڕە پارەیەکی لۆژیکیو ژیرانە، لە مێشکو ناخی خۆتاندا:- سەرەتا لە بڕە پارەی کەم لۆژیکییەوە دەست پێ بکەن، بۆ نموونە: (١٠)ملیۆن دینار، ئامانجتان ئەوە بێت لە قۆناغی یەکەمدا هەموو هەوڵتان بۆ گەیشتن بێت، بەم بڕە پارەیە، دوای گەیشتن بەم بڕە، بیر لە بڕی زیاتر بکەنەوە.

٥- ئەگەر لە قۆناغی یەکەمدا پارەداربوون:- زۆر گرنگ نییە لەلاتان، ئەوا بیر لە ئامانجە گرنگەکانی دیکەتان بکەنەوە؛ وەکو، گەشتکردن، ئارامیو ئاسایشو ئازادیو... هتد.

٦- لە بیری خۆتاندا وادابنێن، کە گەیشتوون بەو شتانەو لەو هەستەتان چێژوەربگرن:- ئەمە خۆی بۆ خۆی، دەبێت بە هۆکارێك، بۆ گەیشتن بەم شتانە، بیر لە پارەش بکەنەوەو پێی بگەن.

٧- دەست هەڵبگرن لە چاولێکەریو بەدواداچوونە دنیاییەکان:- ئێوە بەردەوام بەو هێزە دەرونییەتان، پەیوەندیتان هەیەو وابەستەن بە خودای گەورەوە. چەند کاتێکی کەم دابنێن لە تەنیاییداو هەوڵبدەن پەیوەندی بکەن بەخوداوە، داوای ڕێنموونی لێ بکەن، تا ئێوە بخاتە سەر ڕێگەی ڕاستو پڕ لە سەرکەوتن، بەشێوەیەك، کە بتوانن لە ئارامیو ئاسایشدا بۆ خۆتانو چواردەورتان، ببن بە کەسێکی بەسوود، تەواوی دونیا دەست دەکەن بە یارمەتیدانتو بەویستی ئێوە کاردەکەن، ئەگەر بەس خەیاڵ بکەنو بیر بکەنەوە بەس نییە، بە پراکتیکیو کرداری کاربکەن، زۆرێك لە خەڵکی کە بە حاڵو گوزەرانی ئێستەی خۆیان ڕازی نینو دەزانن لە کاتی دەستبەکاربوونیان بە کارێکی دیکە، ئەوا دەگەن بەخواستو ویستەکانیان، بەڵام ناوێرن هەنگاوێك بچنە پێشەوە، کەواتە: بوێر بنو کاربکەن، ترس خۆی بەربەستە لەبەردەم سەرکەوتندا.

٨- قۆناغەکانی ئیشو کارەکەتان، لە ناخو لەژێر لێوەوە دووبارە بکەنەوە:- بۆ نموونە: پرسیارێك لە خۆتان بپرسن بۆ بەدەستهێنانی بڕێکی پارە، لە ڕێگەیەکی تایبەتەوە، لەگەڵ خۆتاندا بکەونە سەر گفتوگۆوە، (ئەگەر لەم ڕێگایەدا سەرکەوتوونەبووم، ئەوا تەواوی قۆناغەکانی ئەم ڕێگایە، لە مێشکمدا پاك دەکەمەوەو ڕێگایەکی دیکە دەگرمەبەر، تا بگەم بەو بڕە پارەیە.

٩- لە بەربەستەکان مەترسن:- دەریاکان هەمیشە ئارام نین، ژیانیش وەکو دەریا وایە، هەندێجار ناچارن لە ئاوێکی شەپۆلدارو زریانیدا، مەلە بکەن، تا سەر بکەون، زۆرێك لە ئێمە لە کاتی تێکشکان، یان دژواریو ناهەمواریدا، بێهیوا دەبینو لە بەردەوامی ڕێگەکە دەترسین؛ بە ترسو خەمخواردن، نەك هەر ناچنە پێشەوە، بەڵکو گوزەرانی ئێوە لە پێشتر خراپتر دەبێت، هەروەك کارل ساطن دەڵێت:- (واباشترە لەبری بۆڵەبۆڵ لەدەست شوێنێکی تاریك، مۆمێك دابگیرسێنەو ئەوێ ڕۆشن بکەرەوە)، یاوەك دەڵێن: (ماسی هەر کاتێك بیگریت لە ئاو، هەر تازەیە، پەیوەندیو ناختان پاك بکەنەوە، نەك بەتەنیا بەس لە ماڵدا، بەڵکو لە شوێنی کارەکەشتاندا، کۆمەڵگاشدا... پەیوەندییەکانی خۆتان پاك بکەنەوە، بە مەبەستی چاکسازی.. بێگومان هیچ کەس ناتوانێت، بەبێ هاوکاری خەڵکی دیکە، بگات بە ئامانجەکانی، بەڵام ئەگەر بڕیار بێت، ئەم قەرەباڵەغییەو پەیوەندییە بێسوودو پڕ لە ژاوەژاوانە، لەگەڵ ملیۆنان وزەو هەستی نەرێنی بێتو ببێت بە هۆی نەهێشتنی تەرکیزو لێوردبوونەوەو ببێت بە هۆی شێکردنەوەی ناخو ورەتان، وا باشترە پاك بکرێنەوەو لاببرێن.

١٠- گرنگی بدەن بە خواستو حەزەکانتان:- هەر مرۆڤێك بەو شتانەی کە لە ناخیدایە، حەزی تایبەتی هەیە بۆیان، ئەگەر هەرکاتێك کردارێك، یان ئامانجێکتان بەپێی ئەوەبێت کە خواستو ویستان بۆی هەیەو بەوە دەست پێبکەن، ئەو کات دەبینن، کە چۆن ئاسانترو خێراتر دەگەن بە ئامانجەکەتان.. لە ڕاستیدا، ئەمە دەروونی ئێمەیە، کە جەستەمان کەمەندکێش دەکاتو دەیبات بەرەو ڕووی ئەو شتانەی، کە چێژییان لێ دەبینین.



# شێوازەکانی وەستان



هەروەك چۆن ڕۆیشتن، دەرخەرێکی گرنگیی باری دەروونی کەسێکە، وەستانیش بەهەمان شێوە، چەند ئاماژەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە.

**١. گەڵای هەنجیری:-**

بەدانانی دەستەکان لەخواروو کەمەرەوەو توندکردنیان پێکەوە، تا شێوەی گەڵایەك دەردەخات لەکاتی قسەکردندا، ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی کە وەستاوە، لەشتێك دەترسێت، یاخود متمانەی بەخۆی نییەو دەیەوێت لەو ڕێگەیەوە، متمانە بۆخۆی زیاد بکات.

ئەمە لەکاتێکدا وایە، کە کەسەکە بەبێ مەبەست، دەستی وا لێدەکات، بەڵام ئەگەر تێبینیتان کردبێت، ئەم شێوازە وەستانە، زۆر کات لەکاتی وێنەگرتنی بەکۆمەڵدا دەردەکەوێت، کاتێك وێنەگرەکە ناچاریان دەکات، لەنزیك یەکدییەوە ڕابوەستن.

**٢. دەسەڵاتداریو چاودێری:-** لەکاتی دانانی دەستەکان بۆ دواوە، بەشێوازی یەکتربڕو ئاڕاستەی سەریش بۆ پێشەوە، دەرخەری متمانەیەکی زۆرەو ڕەنگە ئاماژەبێت بۆ بەرزیو دەسەڵات، ئەم جوڵەیە زۆربەی کات، خاوەن دەسەڵاتەکان، ئەنجامی دەدەن، وەك: مامۆستای زانکۆو قوتابخانە، پارێزەر، پزیشك، چاودێرەکان لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا.

ئەمەش نامەیەکی نەرێنی، بە بەرامبەر دەگەیەنێت، کە دەڵێت: (تکایە لێرە نزیك مەبەرەوە)، بە دڵنیاییەوە، ئەو کەسانەی دەیانەوێت، ئیجابییانە خۆیان دەربخەن، نزیکی ئەم شێوازە ناکەونەوە.

**٣. بەربەرەکانێو خۆزاڵکردن:-**

دانانی دەستەکان لەسەر کەمەرو قاچەکان دوور لەیەك، ئاماژەیە بۆ خۆزاڵکردنو چەسپاندنی هێزو بەربەرەکانێی بەرامبەر، دەرخەری متمانەیەکی زۆرە بە خۆیو بڕێك لە لووتبەرزی دەگەیەنێت.

هەر بۆیە، زۆربەی ئەو کەسانەی ئەم شێوازە بەکاردەهێنن، بریتین لە: کەسانی دەسەڵاتدار: پۆلیسو پێشەوای سەربازی، لەم کاتەدا، کەسەکە قەبارەی گەورەتر دەردەکەوێتو جێگیرترە، لە هەر شێوازێکی تر، بۆیە هەندێجار بە (وەستانی تاوسی)ش ناو دەبرێت.

**٤. نەبوونی زانیاری:-**

ئەوکاتەی پرسیار لە کەسێك دەکەیتو ئەو کەسەش هەردوو دەستی درێژ دەکات، بەشێوازێك دوور لە لاشەی بێتو لەپی دەستی کراوەیە بەڕووی دەرەوەداو شانەکانیشی بەرز دەکاتەوە بۆ سەرەوە؛ وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە هیچ زانیارییەکی نییە لەسەر ئەو شتەی پرسیاری لێدەکرێتو دەستەکانی درێژ دەکات؛ وەك بەڵگەیەك بۆئەوەی کە ڕاست دەکات.

**٥. خۆگرتنو بێدەنگی:-**

کاتێك کەسێك دەوەستێتو قاچەکانی یەکتربڕن لەسەر شێوەی مقەستو دانانی یەکێك لە دەستەکانی بۆسەر دەمیو بە دەستەکەی تریشی، ئانیشکی ئەو دەستەی دەگرێت (کە لەسەر دەمی داویناوە)و لەگەڵ کەمێك لارکردنەوەی سەر، ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەم کەسە ناڕواتودانانی پەنجەکانی لەسەر دەم ڕێگری دەکات لەسەر قسەکردن، هەر بۆیەش، ئەم شێوازە وەستانە، ئاماژەیە بۆ خۆگرتنو بێدەنگیو کۆنترۆلکردنی خود، دەبێت یەکەمجار ئەم کەسە، لەم بارە دەربهێنیت؛ پێش ئەوەی بکەویتە ناو هەر گفتوگۆو قسەکردنێك لەگەڵیدا.

**٦. وەستانی بەرگرییانە:-**

کاتێك ئارەزووی دانوستانێك دەکەیت، لەگەڵ کەسێکی تردا، دەبینیت هەردوو دەستی لە ئانیشکییەوە نووشتاندۆتەوە بە گۆشەی ٤٥و دەستەکانی ئاڵاندووەتە ناو یەکتری، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی دژی ئەو بیرۆکەو گوفتارانەی بەرامبەرە، کە دەیانکات؛ تەنانەت ئەگەر سەریشی لەقاند لەگەڵیداو زەردەخەنەشی کرد.

لەبەر ئەوە پێویست دەکات لە سەرەتادا، لەم بارە دەربهێنرێت بەوەی خواردنێکی بخرێتە بەردەم، یاخود گفتوگۆیەکە هەڵبگیرێت بۆ کاتێکی تر، لەبەرئەوەی هەر گفتوگۆیەك لەم بارەدا بکرێت، هیچ سوودێکی لێنابینرێت، جگە لە کاتکوشتن نەبێت.

# ئەزموونەکانی ڕابردوو، کەشتیی ئەمڕۆو کەناراوی سبەین

دیاری ئاکۆ

ئێستامان دوێنێی سبەینێمانە، دوێنێش ڕابوردوومانە، ڕابوردووشمان، کۆگای ئەزموونو زانینەکانمانە. خۆش بە حاڵی ئەو مرۆڤەی، کە سوود لە ڕابردوو دەبینێت، لە ئێستادا لەسەر بناغەی هەڵەو ئەزموونەکانی ڕابردووی، نەخشەی داهاتووی دەکێشێت. نمایانە قورئانی پیرۆز، یەك لەسەر سێی چیرۆكو مێژووی گەلانو پەیامبەرانە، کە وابوو خودا پەیامێکمان پێ ڕادەگەیەنێت: لە ئەزموونی کەسانی پێش خۆت سوود ببینە، چونکە سوودی ئەزموونەکان، مایەی دووبارەنەکردنەوەی هەڵەکانە، دووبارەنەکردنەوەیان، مانای ڕزگاربوونە، مانای ژیانێکی ئاوێتەبووە بە بڕیاری درووست. ئەوانەی لە خەونی داهاتوودا دەژین، با وا گومان نەبەن؛ کە ژیاون، ئەوانەشی کە لە ڕابردوودا دەژین، دیسان باوا گومان نەبەن کە ژیاون؛ ژیانی ڕاستەقینە، هەمان ئەو چرکە ساتەیە، کە تۆی تێدا دەژی؛ ئەگەر بڕیار وایە بە لە ڕابردوو ژیاندا بگەڕێتەوە بۆ ئەو ساتانە، ئەوا تێیدا بژی هەر چۆنێك ئارەزوو دەکەیت، خۆ ئەگەر بڕیاریشە، لە داهاتووی ژیاندا، بەبێ هەوڵدانەکانی ئێستا خەونەکانت بەدی بهێنیت، بژیت لە چاوەڕوانیدا هەر چۆنێك ئارەزووی دەکەیت، بەڵام ئایا سەرئەنجام، بە ژیان لە ڕابردوودا، وەك مرۆڤێکی سنووردار، دەتەوێت: مردوو، زیندوو بکەیتەوە؟! لە داهاتووی ژیاندا، دەتەوێت داهاتوویەك بەدەست بخەیت، کە جارێکە نەهاتۆتە دونیاوە؟! بڵێی لە کەسێك، بەدبەختر هەبێت، کە هەوڵی زیندووکردنەوەی مردوو بدات، کە لای ڕوون بێت؛ کردنی وەها کارێك ئەستەمە، ئاواتی بەدەستهێنانی خەونەکانی داهاتوویەك بێت، بەبێ هەوڵدانەکانی ساتی ئێستای کە نەشزانێت، ئاخۆ ئەو داهاتووە دێت، یان نا! کەوابوو چی؟ هەر ئێستا موڵکی تۆیە، بەڵام نابێت ئەو یاسایە، لە بیر بکرێت: کە چ ئێستاو چ داهاتوو، نەوەی ڕابردوون، جا تۆ چی فێربوویت لە ڕابردوو؛ لە زانستو لە ئەزموون، «چۆنێتی»ی جێبەجێکردنییان لە ئێستادا پراکتیزە بکە، ئەوکات لە مانای کێڵگەداریی ئەم ژیانە تێدەگەیت.

پیاوێك بە هێواشی کێشای بە شانی شۆفێرێکی تاکسیدا، وتی: لای خۆتەوە دابەزین هەیە. شۆفێرەکە ڕاچڵەکیو شپرزە بوو، کۆنترۆڵی لەدەستدا، خەریکبوو خۆی بکێشێت بە پاسێکدا، بەڵام هەر چۆنێك بوو خۆی گەیاندە کەناری شۆستەیەك، ماوەی چەند چرکەیەك هیچ وشەیەکی بۆ نەوترا. بێدەنگی باڵی کێشا، تا ئەوەی شۆفێرەکە ڕووی کردە پیاوەکەو وتی: کوڕی باش، جارێکی تر ئەم کارە دووبارە نەکەیتەوە، زەندەقی منت برد، خۆ خەریك بوو لەهۆش خۆ بچم. پیاوەکەش پۆزشی بۆ هێنایەوەو وتی: من نەمدەزانی دەست لە شاندانێك بەو ئەندازەیە تۆ دەترسێنێت! شۆفێرەکە وتی: ڕاست دەکەیت، هەڵەی تۆ نییە، ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژە وەك شۆفێری تاکسی کار دەکەم، چونکە من ٢٥ ساڵە شۆفێری ئەمبولانسی گوێزانەوەی تەرمم.

سەرنج بدەن، ئەزموونەکانی ڕابردوو، چلۆن کاریگەری لەسەر ئێستامان هەیە؟ بەڵام کەسی دڵ هۆشیار، ئەزموونەکانی ڕابردووی دەکاتە کەشتیی ڕزگارکەر لە شەپۆلەکانی دەریای ئێستا، بۆ گەیشتن بە کەناراوی هێمنی داهاتوو.






# زیپکەی لاوان

بلاوترین کێشەی پێستە لەنێو لاواندا، بەشێوەیەك (٨٥٪)ی لاوان توشبوون... نزیکەی (١٥٪)یان زۆر هەراسانو بێزاربوون بەدەستییەوە. هەرچەندە ڕێژەی توشبوون یەکسانە لەنێوان هەردوو ڕەگەز، بەڵام لە کوڕاندا زۆر توندترە.

زیپکەی لاوان لەسەرەتای دەیەی دووەمی تەمەنەوە سەرهەڵدەدات، ئەگەر چارنەکرێت لەکچاندا تا(١٧ساڵیی)و لە کوڕاندا تا (١٩ ساڵیی) بەردەوام دەبێت. توندیی توشبوونەکە لە (٢١ تا ٢٢ ساڵیی) وردەوردە چاکدەبێت..

## ١- زیپکەی لاوان چییە؟

سەرکەوتنو کۆبوونەوەی (چەورییە ڕژێنەکان- sebaceous gland)ە کەلەپێستدایە. زۆربەی ئەم ڕژێنانە لە پێستی ڕووخسارو پشتو سنگدایە، بۆیە ئەم شوێنانە زیادترین شوێنی زیپکەیە. ئەم چەورییە ڕژێنانە لە ژێر کۆنترۆڵی (هۆرمۆنە سێکسییەکان - sex hormones) دایە، لەبەرئەممەیە زیپکە لە کاتی پێگەیشتن (باڵغبوون)دا ڕوودەدات.

ئەو هۆڕمۆنانەی بەشێوەیەکی بنچینەیی هانی دەردانی چەورییە ڕژێنەکان دەدات، پێیاندەوترێت ئەندرۆجینەکان، بریتین لەو هۆڕمۆنانەی گونەکان لەنێرو هێلکەدانەکان لە مێدا دەریاندەدەن.

*** ئەو شتانەی ڕوودانی زیپکە زیادتر دەکەن:-** سوڕی مانگانە، بەرکەوتنی تیشکی خۆر، ئەو کرێمانەی (ستیرۆید - steroids) لەپێکهاتەیاندا هەیە، یان وەرگرتنی لە ڕێی دەمەوە.

زۆربەی لاوان شێوازێکی نامۆی خواردن دەگرنەبەر، بەبیانووی ئەوەی زیپکە پەیوەندیی بەهەندێك خواردنەوە هەیە، بەڵام لەڕاستیدا وانییە.

## ٢- چارەسەری زیپکە چییە؟

دەکرێت چارەسەر بکرێت، بەمەرجێ گوێڕایەڵیی پزیشكو تەندروست بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی پۆچارەسەر وەریدەگریت، جا لە ڕێی پێستەوە بێت، یان بخورێت لە ڕێی دەمەوە، بۆیە دەبینیت (٨٠٪)ی تووشبووان زیپکەکانیان چاکدەبێتەوە بە ڕێژەیەك دەگاتە (٨٠٪) لەماوەی شەش مانگدا، بەڵام ڕەنگە بۆ چەند ساڵێك دوای چاکبوونەوە پێویست بکات بەردەوامبیت لەبەکارهێنانی چارەسەرەکان، بەمەرجێك سەردانی پزیشك بکەیتەوە.

لەڕاستیدا زۆربەی زیپکەی پێست لە تەمەنی هەرزەکارییدا بەچارەسەرێکی سادە چاکدەبێتەوە، ئەگەریش چاك نەبووەوە، ئەوسا پێویست دەکات دژەبەکتریا بەکاربێت.

## ٣- ئاگاداری کرێمە سپیکەرەوەکانی پێستبە:-

خودای گەورە دانیشتووانی ناوچە گەرمەکانی وادروستکردووە کە (ماددەی میلانین) لە پێستیاندا زۆرە، ئەمەش وادەکات کەسە ئەسمەرو ڕەشپێستەکان ئەگەری توشبوونیان بەشێرپەنجەی پێست کەمترە. بەداخەوە دەبینین بانگەشەیەکی زۆر دەکرێت بۆ ئەو کرێمانەی پێست سپی دەکەنەوە، لە کاتێکدا بە هۆی ئەو ماددە زیانبەخشانەی کە تیایدایە لە هەندێ لە وڵاتە ئەورووپییەکانو ئەمریکا قەدەغەکراوە. گرنگترین ماددە کەلەم کرێمو سابووندایە (هایدرۆکوینۆن- hydroquinon )ە کە زۆر مەترسیدارە، بەکارهێنانی ئەم ماددەیە ڕێگری دەکات لە دەردانی میلانین. بەکارهێنانی ئەم کرێمانە هەرچەندە لەسەرەتاوە پێست سپیو جوان دەکات، بەڵام هەرئەوەندەی بەر تیشکی خۆر کەوت ئەوا زیاتر دەبێتە هۆی ڕەشبوونی پێست، بەمەش کەسەکە زیاتر ناچاردەبێت کرێمەکە بەکاربهێنێت.

توێژینەوەکان دەریانخستووە بەکارهێنانی ئەم کرێمانە بۆماوەیەکی زۆر دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی پەڵەو زیپکەی پێست، زیادبوونی ئەگەری شێرپەنجەی پێست، دەبێتە هۆی ڕوودانی پشێوی لە جگەرو گورچیلە.

ئێستا زۆربەی وڵاتە ئەورووپییەکان ڕێگری دەکەن بەرهەمێکی جوانکاری بێتە وڵاتەکەیان ماددەی (hydroquinon)ی تیابێت، وەلێ دەبینین ئەم بەرهەمانە دەنێردرێن بۆ وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقیا، بەشێوەیەك ڕەنگە لەسەر بەرگی دەرەوەی کرێمەکە نەنوسرابێت ئەو ماددەیەی تێدایە.

لەبەر ئەمە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (W.H.O) بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە بۆقەدەغەکردنی ئەو کرێمو سابوونانەی کە (hydroquinon)ی تێدایە... ناوەکانی تری ئەم ماددەیە: benzenediol،benzohydroquinon،benzoquinol،dihydrozybenzene،hydroquinol،quinol،......))

ن: د.حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

# کتێب لە هەر کوێ بێت، من لەوێم!

ئارام نەبی مەحموود

**هەر شوێنێک منی لێ بێت، کتێبی لێیە!
کتێبیش لە هەر کوێ بێت، من لەوێم!**

بۆچی کتێب، لێم جیا نابێتەوە؟ ئەی بۆچی من، پشت لە کتێب ناکەم؟ چ شتێک هەیە، وا منو کتێبی پێکەوە بەستووەتەوە؟ نازانم ڕازو نهێنیی وابەستەبوونی من بە کتێبەوە چییە؟ هەمیشە حەزم بە ژوانی کتێبە، هەمیشە حەزم بە خوێندنەوەیە، بۆ هەر شارێک چووبێتم، پرسیاری کتێبخانەکانیم کردووەو چووم بۆ سەردانیان، نازانم بۆچی؟ بەڵام ناتوانم بێ کتێب بژیم، تەنانەت سەیرکردنی کتێبخانەکەشم، ئارامیم پێ دەبەخشێت، نەبووە ڕۆژێک، لە کتێب بێزاربېم، نەبووە ڕۆژێک، لە ڕێگای چوون بۆ کتێبخانەو چوون بەدەم کتێبەوە ماندووببم، هێندە عاشقی کتێبم، کە بچم بۆ هەر کوێیەک، دەبێت کتێبم پێ بێت، هیچ سەفەرێکم نەکردووە، کتێبم لەگەڵ خۆمدا هەڵنەگرتبێت، بەشێکی خوێندنەوەکانم لە ناو ئۆتۆمبیلداو بەدەم ڕێگاوە بووە، ڕێگای (هەولێر- سۆران)، بە زمانی حاڵ، شایەتی ئەوەم بۆ دەدەن، چوون بۆ ماوەی چوار ساڵ هاتوچۆم لەسەر ئەو ڕێگایەدا بووە، کە قوتابیی زانکۆی سۆران بووم، زۆرێک لە کتێبەکانم لە بەشی پشتەوەیان نووسراوە «سوپاس بۆ خوا تەواو بوو... ناو پاس ڕێگای گەڕانەوە بۆ هەولێر، یان چوون بۆ سۆران!

**کتێب..... کتێب..... کتێب...**

هیچ کەس نییە بڵێت: هاوڕێی تۆمو جارێ لەگەڵمدا ڕێگای کتێبخانەی تەی نەکردبێت، هەموو هاوڕێیانم ئاشنای کتێبخانەکانن! تەواوی هاوڕێکانیشم، پشکی بەخشینی کتێبەکانمیان بەرکەوتووە، شانازی بەوە دەکەم، کە بتوانم دوای فەوتکردنی خۆم، کتێب بۆ نەوەکانم بە میرات جێ بهێڵم!

کەسێک نییە، پێم بڵێت: من بۆچی وام؟ بۆوا شەیدای کتێبم؟

بۆچی وا ناتوانم بێ کتێب بژیم؟ لەوە دڵنیام؛ بێ کتێب ناتوانم هەڵبکەم، بە کتێب ئاودێریی بیابانی دەروونم دەکەم، بە کتێب ڕێنموونیی دڵم دەکەم، کتێب زمانێکی دیکەو گوێچکەیەکی دیکەو چاوێکی دیکەی پێبەخشیم، منی کرد بە خاوەن دەروونێکی ئارام!

ڕەنگە یەکێک لە هۆکارە دیارەکانی ئەوەی کە من کتێبم خۆش دەوێت، ئەوە بێت کە «کتێب ژیانێکی نوێو ماناداری بە من بەخشی»، بەڵام ئەو هۆکارە، بە تەنها بەس نییە، بۆ ئەو شێتییەی من بۆ پەرتووک!

ئێستەش تامو چێژی خوێندنەوەی یەکەم کتێب لە ڕۆحمدا ماوەتەوە، یەکەم کتێب دوای قورئان خوێندبێتمەوە «گوڵاوی سەرمۆر» بوو، یەکەم کتێب بوو، لەبەرگ، تا بەرگ خوێندمەوە! نامرێت ئەو هەستەی لەگەڵ خوێندنەوەی یەکەم کتێب هەستم پێکرد!

ئاه... چەند چێژبەخشە خوێندنەوەی کتێب! چەندە جوانە هاودەمیکردن لەگەڵ کتێب! گەورەییە دۆستی کەسانێک بیت، کە دۆستی کتێبن، وەلێ زۆرێک هەن، هەموو شتێکیان هەیە، خاوەنی هەموو شتێکن، کتێب نەبێت، زۆر دلگرانم بەوەی، کە دەبینم، شوێنی سکپڕکردنو خواردنگەکان، جمەی دێت لە خەڵکو بەرناکەوێت، کەچی کتێبخانەکان چۆڵن، وەکو ئەوەی دەستبردن بۆ کتێب تاوان بێت!

بەسە! من نامەوێت لەمە زیاتر بدوێم، هەستەکانی من بۆ کتێب، پترە لەم وشانەی خراوەتە سەر ئەم پەڕەیە، بەڵام ئەوەندە بەسە، بۆ خاوەن ژیران، تا بە هۆیەوە کتێب بکەن بە هاوڕێی ژیانیانو بە وێنەی مۆمی داگیرساو بیگرن بە دەستیانەوەو تاریکی ژیانیانی، پێ ڕۆشن بکەنەوە!

شناویا محەممەد

# پاڵەوانە هەمیشەییەکان

لەم جەنگەڵستانەی ئێمەدا، ئەگەر یەکێك بتوانێت، سنوورەکانی ئاسایی بوون تێبپەڕێنێتو بگاتە ئەودیوی سنووری ڕێگاکە بە پاڵەوان ناودەبرێتو دەبێت بە جێگەی باس، خەڵکی لێی نزیك دەبنەوەو پشتی پێدەبەستن، بایەخێکی زیاترو گرنگییەکی تایبەتی هەیە، بێئەوەی بپرسن لە چۆنێتیو جۆری ڕێگاکە، کوێرانە بەدوایدا دەکەون، پاڵەوانیش بەوپەڕی شانازیو خۆبەگەورەزانینەوە، ئەگەر ویستی کورتەیەك لە چیرۆکی کاروانەکەی باس دەکاتو بابەتەکان لەبەرژەوەندی خۆیدا ڕێك دەخاتو خەڵکەکەی پێ چەواشە دەکات، ئەگەریش نەیویست، تەنانەت ڕێگای سەرکەوتنەکەشی باس ناکات؛ چونکە دەیەوێت پلەی خۆی لەدەست نەداتو کەس شوێنی ئەو نەگرێتەوە، کورسی زێڕینی شانازی. بەدەست دەهێنێتو لەسەر لووتکەی شاخەکان دەیپارێزێت، بێئاگا لەو زریانو هێرشانەی کە ڕووبەڕوی شاخەکە دەبێتەوەو بە هەزاران هێرشبەری بچووك یەکدەگرنو هێزێکی گەورەی چاوەڕواننەکراو دروست دەکەن بۆ لەناوبردنی خۆیو کورسی زێڕینو تەنانەت ئەگەر بە پێویستی بزانن، ئامادەن ڕووبەڕووی شاخەکەش ببنەوە! ئەمە بریتییە لەو حاڵە خراپەی، کە لە ژیانی هەموو کەسە سەرکەوتووەکاندا هەیە، خەڵکی ئیرەییان پێ دەباتو ئەمانیش پێویستە پارێزگاری لە ژیانیان بکەنو قەناعەت بە خەڵکیش بکەن، مانەوەی پاڵەوانەکان تەنها دەکەوێتە سەر زیرەکیو بەتوانایی خۆیو پلەو پایەو کورسی هیچ بایەخێکی نامێنێتو تەنها کار، کە پێویستە ئەنجامی بدات، ئەوەیە کە چۆن قەناعەت بە خەڵکەکە بکات، کە ئەو بەڕێگەیەکی دروست گەیشتووەتە ئەم پلەیە، یاخود بە میهرەبانیو ژیری خۆی، چۆنێتیی ڕێگای سەرکەوتنەکەی ڕوون بکاتەوە، دەبێت هەموو هەوڵێك بدات، بۆئەوەی کەمێك ئارامی ببەخشێت بە ئەوانەی ئیرەیی پێ دەبەنو بڵێسەی ئەو ئاگرەی کە لە ئەنجامی بەراوردکردنو ئیرەییەوە پەیدابووە، زیاد نەکاتو نەگاتە ئاستی ڕق، چونکە دڕندەیی دڕندەترین زیندەوەری ئەم دونیایە، وەك ڕقی ناخی مرۆڤ، کاریگەریی خراپ بەجێ ناهێڵێت لەسەر ژیان، ئەمە لە کاتێکدا کە لە بنەڕەتدا، شتێك بوونی نییە بە ناوی ڕق! ئەوە تەنها ئەو هەستە واتاییە کە لە ئەنجامی بیرکردنەوەکانمانەوە دروست دەبێتو دواتریش دەبێت بە تێکشکێنەری هەموو ئەو بنەمایانەی، کە ناسنامەی مرۆڤبوونی لەسەر دامەزراوە.

ئەمە دیوە تاریکەکەی ژیانی پاڵەوانەکان بوو لە مەملەکەتی مرۆڤەکاندا، بەڵام ئەگەر ژیانی پاڵەوانەکان، تەنها ڕووی تاریکی هەبێت، ئەوا کەس نایەوێت ببێت بە پاڵەوانو وەك هەموو شتە خراپو نەخوازراوەکانی تر، دەچێتە ناو سنووری ئەو بازنەیەی کە کێشراوە بۆ نەهێکردنو دوورکەوتنەوە.. بۆیە بەو پێیەی کە سەرکەوتن شتێکە، کە هەمووان هەوڵی بۆدەدەنو بە سەرچاوەی بەختەوەربوونی دەزانن، دەبێت ڕوویەکی ڕووناكو جوانی هەبێت کە سەرنجی ئێمە ڕابکێشێتو هەوڵی بۆ بدەین..

لەیلا یەکێکە لە پاڵەوانەکان.. ئەم جارەش خانمێك پاڵەوانی چیرۆکەکەیە، لە ڕاستیدا هەموو کات، خانمان پاڵەوانی چیرۆکەکانن، تەنانەت ئەگەر پیاوێکیش پاڵەوان بێت، بێگومان میهرەبانیی خانمێکی لەگەڵدا بووە، خانمان سەرچاوەی بەختەوەریی هەموو ژیانن، هەموو جیهان لەسەر دەستی میهرەبانی خانمەکان، بەڕێوە دەچێت، مەزنترین پیاوەکانی دنیا، لە ئامێزی خانمێکدا گەورەدەبنو شەونخونیان بۆ دەکرێت، دواتریش هەر خانمێکە، کە سۆزو خۆشەویستیو هێزی پێ دەبەخشێت...

ئەو خانمە، پاڵەوانێکی ڕاستەقینەیە، کە پێمان دەڵێت: بەڵێ، مرۆڤی پاڵەوان ئەرکی زیاترە، وەك لە کەسانی ئاسایی، بەڕاستی ئەو کەسانەی لە ژیاندا براوەن، بە ژیریی خۆیان براوەن، ئەوان بیر دەکەنەوە، کاردەکەن، سەرکەوتوو دەبن، لەگەڵ ئەمانەشدا ئەرکی ئەوەیان لەسەر شانە، پارێزگاری لە ئاستی خۆیان بکەنو نەهێڵن تانەو تیرەکانی خەڵکی تێکیان بشکێنێت، تەنانەت دەشتوانن وا لەخەڵك بکەن، کە چیتر ئیرەییان پێ نەبەنو ئەوانیش هەمان ڕێگەی ئەوان بگرنەبەرو کۆمەڵگەیەکی پڕ لە پاڵەوان دروست بکەن....

خاتوو لەیلا، خانمێکە هەموو ئەو شتانەی هەیە، کە ئاواتی پێ دەخواست، ئەو باس لە چیرۆکی خۆی دەکاتو دەڵێت: ئەو کاتەی لەدایکبووم، دایکم بەهۆی منەوە گیانی سپارد، ئەوە یەکەمین نەهامەتی ژیانم بوو، کە هەر لەو ساتەی چاوەکانم کردەوە، خۆی پێوە هەڵواسیمو کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر ژیانم، زۆربەی کاتەکانی سەردەمی منداڵیم، هەستم بە بێ نازی دەکرد، تەنانەت ئێستاش بۆشاییی خۆشەویستیی دایك، لە ژیانی مندا هەیە، وەك هاوتەمەنەکانم یاریی زۆرم نەبوو، تەنها بووکێکی بچوکی قژئاڵۆزکاوم هەبوو، کە خاڵم لە یەکێك لە جەژنەکاندا بۆی کڕیم، لەگەڵ خانوویەکی لە سیرامیك دروستکراو، کە یاریی کۆنەی یەکێك لە هاوڕێکانم بوو، ئەو نەیدەویستو منیش هەڵمگرت بۆ خۆم.. سیمای من پڕ بوو لە بێنازی، لەگەڵ ئەوەشدا، پڕ بوو لە خەونو خەیاڵی جوان، لەگەڵ هەموو ئەو ژیانە ناخۆشەی، کە بەڕێم دەکرد، بەقەدەر فراوانیی دنیا، خەیاڵی جوانم هەبوو، بۆ داهاتووی خۆم، هەموو کات لەبەرچاوم بووە، کە ڕۆژێك هەموو خەونەکان،

بەدی دێن، خۆم دەکرد بە شازادەیەك، بە عەزییە کلاسیکییەکانەوە لەسەر گالیسکەیەکی ڕازاوە بە گوڵو گوڵزار، بۆنی شنەبای بەهاران بکەم... داپیرەم هەموو کات پێی دەوتم: هەر نیازێکت هەبوو، بە ئاسمانی بسپێرەو باوەڕت پێی هەبێت، کە ڕۆژێك بەدی دێت، ئەو قسەیەی داپیرەم چەسپابوو لای من، هەموو کات سەیری ئاسمانم دەکردو دەموت: خەونەکانم بکەرە ڕاستی، ئاسمانیش بێ دەنگو ئارام سەیری ژیانی منی دەکرد، من تەنها ئەوەم دەبینی، کە سەیرم دەکات، دواتر زانیم، ئەو تەنها سەیری ژیانمی نەدەکرد، بەڵکو کۆنترۆڵیشی دەکرد.. بە تێپەڕبوونی کات، ئەوەم زانی.

کاتێك گەورەبووم، کەمێك ژیان ئاڵۆزییەکانی خۆی نیشانداو دەبوو زیاتر ئاگاداری خۆم بم، چونکە بێ دایك، گەورە بووم ئەگەر هەر هەڵەیەکم کردبا، دوو هێندەی کەسی ئاسایی لەسەرم هەژمار دەکرا، بۆیە زۆر ئاگاداری هەڵسوکەوتەکانم بوومو لە کەس زۆر نزیك نەدەبوومەوە، کاتەکانم بە خوێندن بردە سەرو لە ژیانی کەسانی ترەوە ئەوەندە ئەزموونم وەرگرتبوو، کە ئەگەر لەم تەمەنەدا هەڵەیەك بکەم، بە ئەندازەی هەڵەکە سزا دەدرێم، من وردە وردەو ڕۆژ بەڕۆژ، گەورە دەبووم لەگەڵ خەیاڵەکانمدا، هەمیشە خەیاڵم دەکرد کە ئەگەر ڕۆژێك دەوڵەمەندبووم، یارمەتی منداڵانی بێدایكو باوك بدەم، چونکە ئاگاداری ئەو بۆشاییە بووم، کە لە ژیانیاندا هەبوو، هەموو کاتیش حەزم کردووە، ببم بە مامۆستا، چونکە ئەو پیشەیە، لەگەڵ دەروونی مرۆڤ کار دەکات، نەك تەنها جەستەی! مرۆڤەکان لە ڕووی دەروونییەوە، پێ دەگەیەنو ئەوەندە ژیرییان پێ دەبەخشن، هەتا بتوانن خۆیان چاودێری جەستەیان بکەن.. من کە خاوەنی خەونە جۆراوجۆرەکانی خۆم بوومو واقیعیش بەهەموو شێوەیەك، دژ بە من بوو، چونکە نە پارەم هەبوو، نە دەسەڵاتێکی وام هەبوو، بتوانم خۆم درووست بکەم، نە ژینگەیەکی خێزانیی وام هەبوو، کە بتوانن هاوکاریم بکەنو دەستم بگرن بەرەو ئەو ڕێگایەی خۆم دەمەوێت، تاکە شتێك کە هەم بوو، باوەڕم بە خەونەکانم هەبوو، بە بەدیهێنەری خەونەکانیشم...

کچێکی بەهێزی پڕ لە هیوام لێدەرچووبوو، تانەو تەشەری خەڵك، کە دەیانوت وا هەڵسوکەوت مەکە، وەك هەموو دنیات هەبێت، خەونی گەورە مەبینە، سنووری خۆت بزانە، تۆ هەژاری .... ئەمانەو دەیان قسەی تر، کە هەر ڕۆژەو یەکێك تیرەکەی خۆی ئاراستە دەکردم، تەنها هۆکاریش بۆ ئەوە بەهێزی ئیرادەی من بوو، لە ژینگەیەکی تەماویو نادیاردا، ژیانێکی پڕ لە گەشبینیو خەندەم بۆ خۆم درووست کردبوو.. تێڕامانەکانم بۆ ئاسمان، هەر مابوو، هەر بۆیە ئاسمانیش وەڵامی دامەوە، من بووم بە مامۆستا.. ئاگاداری بارودۆخی ماڵەوە دەبوومو لانی کەم ئەرکێکم لەسەر ئەوان کەم دەکردەوە، وردە وردە هەستم دەکرد، بەشێوەیەکی زۆر چاوەڕوانەکراو، خودا دەیەوێت پێش بکەوم، بەردەوام چالاکیم هەبوو، بەردەوام خزمەتم دەکرد، بەردەوام دەمخوێندەوە، بەشداری ئەو کارانەم دەکرد، کە خزمەت دەکات؛ هەرچییەك بێت.. ژیانێکی فرە لایەنم بۆ درووست بووبوو، هەستم دەکرد، ژیان هەلێکی پێ بەخشیوم، من بووم بە کەسێکی سەرکەوتوو لە کارەکەمداو خانمێکی وام لە خۆم درووست کرد، کە ببم بە جێگەی سەرنجو گرنگی پێدان، لە چەند شوێنێکی جیاواز کارم دەکردو بەردەوام کێشەکانم چارەسەر دەکرد، هەڵبەت ئەو ژیرییەی کە هەمبوو پێمبەخشرابوو، نەك خۆم درووستی بکەم، هەر بۆیە هەموو کات سوپاسگوزار بوووم، من بووم بە کەسێکی دیارو مامۆستایەکی لێهاتوو و مرۆڤێکی ژیرو خاوەن ویژدانو میهرەبان، دەمزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکەم، کە خۆشیاندەوێمو لەوەش زیاتر دەمزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەوانەدا، بکەم کە ئیرەییم پێ دەبەنو ڕقیان لێمە، من ژیانێکم بە دەستهێنا، کە وام هەست دەکرد، هیچ کەس نییە، ڕقی لە من بێت، بێگومان ئەوەش بەهۆی خۆمەوە بوو، نهێنیی چوونە ناو دڵی خەڵکی، ئەوەیە ڕێگاکانیان نیشان بدەو ئەگەر خەوشێکی لەسەربوو، تۆ گەورەیی بنوێنەو لایبەرە، ئیتر ناتوانێت ڕقی لێت بێت، چونکە هەرچۆنێك بێت، ئێمە هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤدا دەکەین.

ئێستاش.. خاوەنی کۆشکی شازادەکان نیم، بەڵام ماڵێکم هەیە؛ پڕە لە جوانیو خۆشەویستی میهرەبانی، پڕۆسەی هاوسەرگیریم بەسەرکەوتوویی ئەنجامداو لەگەڵ کەسێکدا دەژیم، کە سەرچاوەی سەرکەوتنو پێشکەوتنی منەو ڕۆژ بە ڕۆژ فێری میهرەبانی زیاترم دەکات.. بەیانیانی ماڵەکەم پڕە لە ئاوازی ناسکی چۆلەکەکانو ماسییەکانیش، ژیانی خۆیان بەڕێ دەکەن بەئارامی لەناو ئەو حەوزە بچوکەدا.. مامۆستایەکی سەرکەوتووو لێهاتوومو خوێندکارەکانم بە باشی فێردەکەم، ئەوانیش بەیەکەوە من فێری ژیان دەکەن.. من ئێستا سەرپەرشتی خانەیەکی بێدایكو باوکان دەکەمو هەر کارێك کە بتوانم بۆ دڵخۆشکردنو باش ژیانی ئەوان دەیکەم... کەسێکم لە هەموو لایەنەکانی ژیانمەوە دڵخۆشم، ئەگەر کێشەیەکیش بێتە پێشەوە، ڕاستەوخۆ بەدوای چارەسەردا، دەگەڕێمو بە هاوکاری کەسە دڵسۆزەکانم چارەسەری دەکەین، هیچ شتێك کێشە نییە، چونکە هەموو کێشەیەك، چارەسەری هەیە، کەواتە: کێشە بوونی نامێنێت لە کۆتاییدا.

(لەیلا کەسێکی بەختەوەرە).. هۆکاری بەختەوەری ئەم خاتوونەش، پێش هەموو شتێك، دانەبڕانی بوو لە داواکردن لە ئاسمان، هێزێکی سروشتی، کە هێزی پەروەردگارە لە ئاسماندا بەئارامیو دەسەڵاتی بێسنووری خۆی سەیری ژیانمان دەکاتو چاوەڕێی داواکارییەکانی ئێمە دەکات، تا بۆمان بەدی بهێنێت، بارودۆخمان هەرچۆنێك بێت، لە کۆتاییدا هەر لەلایەن پەروەردگارەوە کۆنترۆڵ دەکرێتو هەرگیز بێهیوامان ناکات.

هۆکارێکی تر لە هۆکارەکانی بەختەوەریی خاتوو لەیلا، هەبوونی خەونو خەیاڵ بوو، لە هەموو ئەو بارودۆخە دژوارانەی کە لەناویاندا دەژیا، هەرگیز وازی لە خەونو خەیاڵەکانی نەهێنا، متمانەی بە تواناکانی خۆی هەبوو، ئەو دەیزانی کە دەبێت بە کەسێکی بەختەوەرو سەرکەوتوو، بەڵام چۆن سەرکەوتوویەك؟ ئەو کەسە سەرکەوتووە نا، کە لەسەرەتادا باسمان کرد، کەس خۆشی ناوێتو ئیرەیی پێ دەبەن، ئەویش کورسی شانازی بەدەست بهێنێتو پارێزگاریی لێبکات، ئەو بە میهرەبانیو ژیری خۆی، خۆی کرد بە نموونەو ڕابەرێك بۆ ئەوانی تریش، بووە بە مامۆستای ژیانو هەموو وانەکانی بەختەوەری، فێری هەموو ئەو کەسانە دەکرد، کە دەیانویست وەك ئەو بژین.

ژیان نەگۆڕە، بەپێی بیرکردنەوەکانی خۆمان هەڵسوکەوتمان لەگەڵدا دەکات، چی داوا بکەین ئەوەمان پێ دەبەخشێت.. (جیهانی هەموو کەسێك بە ئەندازەی بیرکردنەوەکانی خۆی دەبێت) هەر ئەمەشە، جیاوازیی نێوان پاڵەوانەکانو کەسانی ئاسایی درووست دەکات.

# بە کەم ڕازی مەبن

ن: د. عبدالکریم بکار و: ئاسیا صەلاح

کچ و کوڕەکانم، بە ویستی خودا، ئێوە دەبن بە نەخشێنەری داهاتووی ئەم نەتەوەیە، گەر ئێوە چاکسازو بەهێزو داهێنەر بن، نەتەوەکەشمان بە هەمان شێوە دەبێت، ئوممەتی ئیسلام خوازیاری گەڕاندنەوەی ڕۆڵە پێشەواییەکەیو ئەو پێگەیەتی کە لە نێوان نەتەوەکاندا هەیبووە، هەر بۆیەش پێویستی بە چینێکی تازەیە، کە تێربێت لە خوڕەوشتەکانی ئیسلامو لێوانلێو بێت لە هیوا، بتوانێت ببەخشێتو ئارامگر بێت لەسەر درێژی ڕێگاو ویستەکانی بێسنوور بێت.

ئازیزانم، دەستپێکی ئەمە، بریتییە لە: نیازی پاکو هەوڵدان بۆ ڕازی خودای (بالا دەست) هەر نیازی چاکە، کە کارە بچووکەکان گەورە دەکاتەوە، هەر نیازی خراپیشە، کە کارە گەورەکان، دەکات بە کارانێکی بچووك. کاتێك یەکێکتان دڵنیا دەبێتەوە، کە لەسەر ڕێگە ڕاستەکە هەنگاو دەنێت، با بە کەم ڕازی نەبێت، گەر ئەو هیوابەرز ویستە ناوازانەتان دەزانی، کە مەزنانی ئەم نەتەوەیە، هەڵیان گرتووە، دەتانزانی کە شارستانێتیی مەزنی ئیسلام، چۆن بنیاتنراوە، دەگێڕنەوە لە هەندی کچی عوتبە -ڕەزای خودای لێبێت- بە یەکێك لە شەقامەکانی شاری مەککەدا تێدەپەڕی، موعاویەی کوڕیشی لەگەڵدا بوو، ئافرەتێك پێی وت: ئەم کوڕەی تۆ دەبێت بە سەرکردەی قەومەکەی. هندیش لە وەڵامدا وتی: خودا لێم بسەنێتەوە، ئەگەر تەنها ببێت بەسەرکردەی قەومەکەی! موعاویە -ڕەزای خودای لێبێت- بۆ ماوەی بیست ساڵ بە والی گشتی شام مایەوە! هەروەها پێشەوای گشتیی هەموو موسوڵمانان بوو بۆ ماوەی بیست ساڵی تر. ستایشی ئاواتە بەرزەکانیان دەکرد بە چەندەها دەربڕین، بە هۆنراوە، هەروەها بە پەخشانیش، لەوانە وتەی (الجنید): " هیچ کەسێك شتێکی بە دڵو بەگیان داوا نەکردووە، هەر بەدەستی هێناوە، گەر هەمووشی بەدەست نەهێنابێت بەشێکی دەستکەوتووە ". هەروەها ابن القیم دەفەرموێت ؛ " خواستبەرزی ئاماژەیە بۆ کامڵی ئەقڵو ئەوەی بەکەم ڕازیبێت کەسێکی کەمە "

متنبی لەم بارەوە دەڵێت:

واذا كانت النفوس كبارا
تعبت فی مرادها الأجسام

واتە: گەر نەفسەکان گەورەبوون
جەستەش لەپێناویاندا ماندوو دەبێت.

کچ و کوڕەکانم، گوێچکەکانتان کەڕ بکەن، لەئاست ئەو کەسەی دەڵێت: "هیچ توانایەك نییە، داهێنانی زیاتری تێدا بکەم" هەروەها لە ئاست ئەو کەسەش کە دەڵێت: "کەسی پێشتر هیچی بۆ دوای خۆی جێ نەهێشتووە". مەیدانەکەش پڕە لە هەلی ناوازە، کە پێشتر بوونیان نەبووە. ئێوە پێویستتان بە خواستێکی بەرزە، تا بتوانن بە شێوازێکی نموونەیی کاتەکانتان بەرهەمدار بکەن، ئەزموون پێمان دەڵێت، کە کات بە هەڵم دەبێت، گەر بە هیواکانی داهاتوو پەستانی نەخەینە سەرو توانا شاراوەو توانستە زگماکیەکانتان بە ناچالاکیو کەنارگیری دەمێننەوە گەر نەیگەیەنن‌و هاندەری نەبن لە ڕێگەی ئامانجە گەورەو درەوشاوەکانەوە.

ئەم ڕاستییانە، هەموو جیهان لەسەری هاوڕان‌و ڕەوا نییە، چاوی لێ غافڵ بکرێت.

## ئەمانە چی دەگەیەنن لای کوڕو کچەکانم؟

١. بەبەردەوامی خۆتان بەدوور بگرن، لە نا ئومێدیو خەفەت، هەرگیز گوێ ڕامەدێرن بۆ ئەو کەسانەی ترس لە ناختاندا دەچێنن، ڕاپێچتان دەکەن بەرەو دواوە.

خەون ببینن بە دەستکەوتنی شتەکان، لە چوارچێوەی ڕێساو ڕابەرایەتیی دینەکەتان، جڵەوگیری خەونەکانتان بن، دواتر بیر لەو ڕێگایانە بکەنەوە، کە دەتوانن بیگرنەبەر بۆ گەیشتن بەوەی خەونی پێوە دەبینن، چەندە جوانە، فەرموودەی یەکێك لە زانایان: " گەنجی بە ڕەشی تاڵە مووەکانو پرشنگی ڕووخسارەکان نییە، بەڵکو گەنجی بەرەوپێشچوونی بەردەوامە، لەسەر ئاستی ئەقڵو ڕۆحو لەسەر ئاستی ویستو خواستەکانیش ".

٢. سامی یەکەم هەنگاو بشکێنن، لە قسەو پلاندانانەوە هەنگاو بنێن بەرەو جێبەجێکردن.

٣. کەمێك لە کاتتان تەرخان بکەن بۆ بەرەوپێشبردنی خودی خۆتانو سوود ببینن لەو توانایانەی لەبەردەستتاندایە.

٤. خۆتان ڕابهێنن لەسەر هەستانەوە لە دوای هەر هەڵدێرێكو سەرلەنوێ دەستپێکردنەوە، لە دوای هەر کۆسپێك، چونکە ڕێگای شکۆمەندی پڕە لە دڕكو بەرد.

٤. خەمی مەزنانو خواستەکانیان گەورەن‌و خەمی بچووکانیش بچووکن، هەندێك لە خەڵکی خاوەنی هەموو توخمەکەنی مەزنین، بەڵام نەبوون بە مەزنێك، تەنها لەبەرئەوەی ویستەکانیان هیچن!



# ژیان وەك چیایە!

شێنێ والی

سروشتی ژیان وەهایە، کە دەبێت هەموومان بە ناخۆشیو خۆشییەکانی بەهارەگەشتی ژیاندا، گوزەر بکەینو سەرەنجامیش کۆتایی بە بەهارە گەشتی ژیانی هەر تاکێك لە ئێمە بێت، ژیان بەم جۆرە بەردەوام بووەو بەردەوامیش دەبێت، هەریەك لە مرۆڤەکان، دەتوانن بە جۆرێك ئەم تابلۆیەی ژیان بنەخشێنن، کەسانێکی زۆر لەم ژیانەدا، ئەم تابلۆیە بە ڕەنگە تاریكو نەخوازراوەکان دەنەخشێنن، باشە بۆچی دەبێت بەم جۆرە ڕەنگانە بێت؟ مەگەر هەلگرتنی هەر ڕەنگێك، بەدەستی خۆت نییە؟! کەواتە: بە ناوی خودا دەست پێبکەو ڕەنگی ڕوونو کاڵ بەکار بهێنە بۆ نەخشاندنی تابلۆکەی ژیانت.

ژیانی منو تۆ، وەك چیایەکی بڵندو سەرکەش واین، کە پێویست دەکات، کە تا ئەو دیوی چیاکە بڕۆین، جا بە دژواری بێت، یان بەئاسانی، یان بە سەرکەوتووانە. بەڵێ، کەواتە: باشترینیان ئەوەیە، کە بەسەرکەوتوویی و ئاسانی بیبڕین، چۆن؟

لە کاتی سەرکەوتن، بەسەر شاخەکەدا، چەندین چاڵو بەردو سەختیو دژواری دێتە سەر ڕێمان، بەڵام سەکەوتووترین مرۆڤ، ئەو کەسەیە کە هەر بەربەستێك، بە هەند وەردەگرێت، بۆ دوورخستنەوەی مەترسییەکان لەسەر ڕێگاکەی، وەك ئەوەی کە تۆ، بەسەر چیایەکدا سەربکەویت، لە کاتی بڕینی نیوەی ڕێگاکەدا، پێیەکانت لە بەردێك هەڵبکەوێتو بدات بە زەویدا، بەڵام خۆ تۆ کۆتایت نەهاتووە، دوای هەموو کەوتنێك، هەستانەوە هەیەو هەروەك چۆن کەوتنی باران، جوانترین سەوزایی، بەدوای خۆیدا دەهێنێت، تۆش وەك بارانبەو دوای کەوتنت، باشتر کاربکە، کەواتە: تۆ وانەیەك وەردەگریت، ئەویش ئەوەیە کە تۆ فێربوویت، کە چۆن پێکانت دابنێیت لەسەر بەردێك، کە لەڤەو ئەگەری کەوتنی هەیە لە هەر کاتێکدا بێت، یان چۆنێتیی دانانی پێیەکانت لە شوێنێك، کە بەردو بەربەستی لێ نییە، لەوانەیە لەبەر باشتر بڕینی ڕێگاکەت ناچار بیت، ڕێگەکەت لار بکەیتەوەو دوورتری بکەیت، بۆ سەرکەوتن بەسەر چیاکەدا، هەرچۆنێك بێت، لەوە باشترە، کە بە ڕێکی بڕۆیتو گرانتربێتو ئەگەری کەوتنت، زیاتر بێت؛ کاتێك تۆ بەردەکەت، بەجێهێشت وریابە! ئاوڕ لەو بەردە نەدەیتەوە، کە بە هۆیەوە کەوتیت، چونکە ئاوڕدانەوە، لە ڕابوردوو ئێستاو ئایندەت لەدەست دەدات، لەبەرئەوە پێویست ناکات، تۆ دووبارە سەیری بکەیتەوە، چونکە لەکاتی تێڕوانینت لە بەردەکە، تۆ خوارەوە دەبینیتو هەموو تەنگو چەڵەمەکان دەبینیتو سەرت بەگێژدا دێت، لەوانەیە جارێکی دی بکەویتەوە، هەر لەبەر ئەم هۆکارە، سەیر مەکە، ئەوە باشترینە، چونکە تۆ جارێك لەوێدا کەوتوویتو هەر لەو شوێنەدا، بڕیارت دا، کە سەرکەوتوو بیت، پەندت وەرگرتووە، وات لێهاتوە؛ دەزانی ئەمە شکست نییە، بەڵکو ئاگادارییەکە، کە دەڵێت ئەم ڕێگایە هەڵەیە، ڕێگایەکی باشتر تاقیبکەوە، لە کۆتاییدا تۆ بەشێوەیەکی باشو سەرکەوتووانەو بە پشتبەستن بە خودا، بەسەر چیای ژیانتدا سەرکەوتوویت، هەوڵبدە هیوابەخش بیت، هەم بۆ خۆت، هەمیش بۆ خەڵکی، چرایەك بیت، کە هەمیشە هەڵکراوەو پرشنگدارە؛ بە جۆرێك بەهەر شوێنێکدا ڕۆیشتیت، ڕووناکی لەچواردەورت پەرش بێت، دەتوانین (برایس) وەك نموونەی کەسێکی ئامانجدارو چاونەترسو سەرکەوتوو بەسەر بەربەستەکانی ژیاندا بهێنینەوە. بابزانین (برایس) کێیە؟ چی کردووەو بەچی ناودارە؟

(برایس) ئەو کەسەیە، کە توانیویەتی پێوانەی سەرکەوتن بەسەر چیای "تیتۆن" بشکێنێت، ئەم چیایە نزیکەی (١٣٧٧٦)پێ لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە، برایس بە منداڵی، لە یاری بەیسبۆڵدا، بێوێنە بوو، بەڵام تووشی ڕووداوێکی کارەساتبار بووە. ڕۆژێك کاتێك کە یاری بە تفەنگ دەکرد، گوللەیەك دەرچوو، بەر چاوی کەوت، دکتۆرەکان نەیاندەتوانی دەستکاری گوللەکە بکەن، چونکە دەیانزانی گەر دەستکاریی چاوی بکەن، کوێر دەبێت، دوای چەند مانگێك، بە هەمان زەوقو شەوقی جارانەوە، گەڕایەوە بۆ کردنی یاری بەیسبۆڵ، بەڵام، بە هۆی لاوازی چاوە بریندارەکەیەوە، نەیدەتوانی تۆپەکە ببینێت، لەبەرئەوە زۆر خەمباربوو، نائومێدی پێوە دیاربوو، بەڵام بیری کردەوە کە ئەو دەتوانێت کارێکی دیکە بدۆزێتەوە، کە ببێت بە ئارەزووی ژیانیو خەونی هەمیشەیی. پاش ماوەیەك بیر لەوە دەکاتەوە، بەسەرچیای تیتۆندا سەربکەوێت، کە لە نزیكماڵیانەوە بوو، دوای چەند مانگێك لە مەشقو ڕاهێنان، توانی بەسەر کێوەکەدا زاڵ بێتو لە ماوەی دوو ڕۆژدا سەربکەوێت، بەڵام پێش ئەو، بە کاتێکی کەمتر، ئەو چیایە بڕدرابوو، دووبارە هەوڵی دا، بە کەمتر بیبڕێت، پاش هەوڵو تێکۆشانێکی زیاتر، توانی لە (٢٦ی ئابی ساڵی١٩٨١) برایس بە (سێ کاتژمێرو چلو حەوت خولەكو چوار چرکە) ئەو پێوەرەی پێشتر بشکێنێت کە بە چوارکاتژمێرو یانزە خولەك بڕدرابوو، لەلایەن (جۆك گریدن)، پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك، هەواڵ گەیشت بە برایس ئەو پێوەرەی ئەو شکێنراوە، لەلایەن (کریستۆن)، لەبەرئەوە بڕیاریدا کە دووبارە پلەی یەکەمی بەدەست بهێنێتەوە، بۆیە دواجار لە (٢٦ ئابی ١٩٨٣ ) دووبارە برایس، بە کەلوپەلی شاخەوانییەوە، بینرایەوەو توانی لە ماوەی (کاتژمێرێكو پەنجاو سێ خولەك)، بە بێ وەستان، بگاتە سەر لوتکەی چیاکە، تەواو هەوڵی خۆی بەگەڕ خستبوو، بە بەدیهێنانی خەونو ئاواتەکەی، بە سەرجەمی سەرکەوتن بۆ لوتکەو هاتنەخوارەوەی توانی بە (سێ کاتژمێرو شەش خولەكو بیستو پێنج چرکە) ببڕێت، کە کەمترین پێوانەبوو، تا ئەو کاتە بڕدرابوو، هەر زوو هەواڵەکە بڵاو بووەوە، (برایس) بە باشترین شاخەوانی ناوچەکە دانرا، لەمبارەیەوە خۆی دەڵێت: شاخەوانی ناسنامەیەکی پێبەخشیم، پێویستە هەرکەسە لە شتێکدا بەناو بانگ بێت، وای لێکردم زۆر متمانەم، بەخۆم هەبێتو بوو بە هۆی دەربڕینی خودی خۆم.

(برایس) ئێستا بوەتە دامەزرێنەرو سەرۆکی کۆمپانیایەکی هەرە سەرکەوتووی دروستکردنی جانتای تایبەت بە شاخەوان، لەوەش گرنگتر ئەوەیە، کە برایس ژیانی ڕۆژانەی خۆیو خێزانەکەی بە پیشەیەك دابین دەکات، کە حەزی لێیەو شارەزایی تێدایە. کەواتە: توانای تۆ لەوە زیاترە، کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە، تۆش وەك برایس بتوانەو هیواکانت بەدی بهێنێت.

شایەنی باسە، تا ئێستا پێوانەکەی (برایس) نەشکێنراوە!

# بوێریی بالۆڵ لە بەرامبەر خەلیفەدا..

لە چیرۆکی ئەمجارەدا، باس لە ئازاییو بوێریی بالۆڵی حەکیم دەکەین، سەبارەت بە وەڵامدانەوە بەهێزو پڕماناکانی، بەرامبەر بە خەلیفە هاروون..

ڕۆژێکیان، حەکیم لەسەر شەقامێك ڕاوەستابوو، کاروانی کەژاوەی خەلیفە، بە کۆمەڵێك سەربازەوە بە بەردەمیدا تێدەپەڕن، بالۆڵیش، بە دەنگی بەرز هاوار دەکاتو دەڵێت: ئەی هاروون... هاروون کە خەلیفەی وڵاتو دەسەڵاتدارەو کۆمەڵێك سەربازی لەگەڵدایەو بە نێو شەقامەکانی شاردا، بە لە خۆباییبوونەوە ڕێگە تەی دەکەن.. سەرسام دەبێت، کە کەسێك بەو شێوەیە بانگی دەکات، هەر بۆیە دەپرسێت: ئەوە کێیە بانگم دەکات؟

سەربازەکان وتیان: جەنابی خەلیفە ئەوە بالۆڵە!

خەلیفە بانگی کردو وتی: بالۆڵ ئایا دەزانیت من کێم؟

وتی: بەڵێ باش دەزانم، کە جەنابتان کێن!!

خەلیفە وتی: کەواتە من کێم؟

حەکیم لە وەڵامدا وتی: تۆ ئەو کەسەیت، ئەگەر کەسێك لە ڕۆژهەڵات ستەمی لێ بکرێت، تۆش لە ڕۆژئاوا بیت، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا، لە تۆ دەپرسێتەوە لەسەر ئەو ستەمەو محاسەبەت دەکات!!

خەلیفە بە بیستنی ئەو وەڵامە گورچکبڕە، چاوەکانی پڕبوون لە ئەسرین، بە گریانەوە وتی: ئەی بالۆڵ حاڵی من چۆن دەبینیت؟

حەکیم وتی: خۆت بخەرە بەر تەرازووی ئەم ئایەتە پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرمووێت:-

﴿ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ۝١٣ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ۝١٤ ﴾ الانفطار: ١٣ — ١٤

واتە: چاکەکاران لە بەهەشتی بەریندان، خراپەکارانیش لە دۆزەخدان..

ئەی کردەوەکانی من چۆن دەبینیت؟

حەکیم وتی: خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ المائدة: ٢٧ واتە: خودای گەورە تەنها لە پارێزکاران، چاکە قبوڵ دەکات.

خەلیفە وتی: ئەی نزیکایەتیی من لەگەڵ پێشەوای مرۆڤایەتی (سەلامی خوای لێبێت) چۆن دەبینیت؟

حەکیم وتی: ﴿ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾ المؤمنون: ١٠١ واتە: هیچ پەیوەندییەکی خزمایەتی لەو ڕۆژەدا نییەو کەس لە کەس ناپرسێتەوە!(کەس خەمی کەسی نییەو هەر کەس خەمی خۆیەتی)!

ئەی شەفاعەتی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) چی؟

حەکیم بەم ئایەتە وەڵامی دایەوە: ﴿ يَوۡمَئِذٖ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾ طه: ١٠٩ واتە: لەو ڕۆژەدا تکاو شەفاعەت لە کەس وەرناگیرێتو بێسوودە، مەگەر کەسێك خودای میهرەبان مۆڵەتی بدات.

پاشان خەلیفە وتی: ئەی بالۆڵ، ئایا پێویستییەکت هەیە، تا بۆت جێبەجێ بکەم؟

حەکیم وتی: بەڵێ.

خەلیفە وتی: هەرچیت دەوێت، پێم بڵێ، تا بۆت جێبەجێ بکەم..

حەکیم وتی: دەمەوێت لێم خۆشبیتو بمخەیتە بەهەشتەوە!

خەلیفە وتی: خۆت دەزانیت، ئەوە بە دەستی منو لە دەسەڵاتی مندا نییە.. ئەی بالۆڵ.

حەکیم وتی: ئەی کەواتە: تۆ دەتوانیت چیم بۆ بکەیت؟

خەلیفە وتی: ئەگەر قەرزی کەسێکت لەلایە. پێم بڵێ، تا بۆت بدەمەوە؟

حەکیم وتی: ئەی هاروون قەرز تەنها بە قەرز دەدرێتەوە.. کەواتە ماڵی خەڵکی بگێڕەوە بۆ خاوەنەکانیان.

هارون وتی: فەرمان دەکەم کە ڕۆزیی تۆ لەسەر من بێت، تا ئەو ساتەی لە ژیاندایت..

حەکیم وتی: ئەی هارون منیشو تۆش، بەندەی خودای گەورەین، ئایا وا هەست دەکەیت تۆی لە یادەو منی لە یاد کردووە؟؟!!

خەلیفە بە وەڵامەکەی حەکیم شەرمەزار بوو!

# ئایا کەسێکی داهێنەریت؟




ئەگەر دەتەوێت بزانیت، تۆ کەسێکی داهێنەرو بەئەزموونیت، یـان نـا.. ئەوا بە (بەڵێ)، یـان (نەخێر)، یـان (هەندێجار) وەڵام بدەرەوە:-

١- ئایـا توانـای درك پێكـردنو چارەسـەرکردنی ئـەو گیروگرفتانەت هەیە، کە لە چواردەورت ڕوودەدەن؟

٢- ئایا بە شێوەیەکی ئەرێنی، کارلێك لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی چواردەورتدا دەکەیت؟

٣- ئایـا دەتوانیت، هەمیشـە وەکو هەنـگ مامەڵە بکەیتو بەردەوام لە گەڕانو جووڵەو هەوڵداندا بیت؟

٤- ئایـا بەشـێوەیەکی بەرچـاو، حـەز بـە خوێندنەوەو موتاڵاکردن دەکەیت؟

٥- ئایا ی بیرتیژو خاوەن خەیاڵێکی فراوانیت؟

٦- لـە کاتـی ڕووبەڕووبوونـەوەی هەڵوێسـتە دژوارو سـەختەکاندا، توانـات هەیە چەندین بیرۆکەی نوێو پێشـنیاری گونجاو پێشکەش بکەیت؟

٧- کاتێـك ڕووبـەڕووی کێشـەو گرفـتو نارەحەتییەکانی ژیان دەبیتەوە، بیرۆکەو پێشنیاری جێگرەوەو چارەسەری گونجاو دەخەیتە ڕوو؟

٨- ئایا شتەکانی دەوروبەرت، بە مەبەستی جیاوازتر، لەوەی هەیە، بەکاردەهێنیت؟

٩- ئایا ڕقت لە ڕۆیشتنە لە دوای کەسانی دیکەوەو ڕقت لە لاساییکردنەوەو شوێنکەوتنی کەسانی دیکەیە؟

١٠- ئایا وا هەسـت دەکەیت، خەڵکی نەرمونیانو هاوسەنگن لەگەڵتداو وشكو بێهەڵوێست نین؟

١١- ئایـا مێشـکت بە لەبەرکـردنو یادخسـتنەوە ماندوو دەبێت؟

١٢- ئایا لە هەر کارێکی چاكو ڕێکوپێك، خەڵکی دەزانن کە تۆ پەیڕەوی دەکەیتو پابەندیت پێیەوە؟

١٣- لەگـەڵ ئەم دەسـتەواژەیەدا هاوڕایـت: «حەزکردن لە جەربەزەییو ئەزموون، زۆرتر سوود دەگەیەنێت»؟

تێبینی:- بۆ (وەڵامی بەڵێ: دوو خاڵ)، (وەڵامی نەخێر: ٠،٥ خاڵ)، وەڵامی (هەندێجار: یەك خاڵ) دابنێ..

**ئەنجام:-**

**یەکـەم:-** ئەگـەر توانیـت (٢٠) خاڵ، یان زیاتر بەدەسـت بهێنیت، ئەوا تۆ، کەسێکی بەئەزموونو داهێنەریت، ئامۆژگاریمان بـۆ تـۆی بەڕێز، ئەوەیـە: کە بـەردەوام بیت لەسـەر بەرنامەی ژیانـت، بەردەوام بە لەسـەر هەمان شـێوەو شـێوازی ژیانت، بۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی گرفـتو کێشـەکانی ژیانـت، بـۆ چۆنێتیی مامەڵەکردن لەگەڵ ڕووداوەکانی چواردەورت.

لە قۆناغی سـەرەتادا مشـتومڕی بیرۆکەو پێشـنیارەکانت، لەگەڵ ئەو کەسانەدا مەکە، کە زۆر ڕەخنە دەگرنو هەڵسەنگاندنێکی نەرێنییانـە بـۆ چواردەوریـان دەکـەن، هەرگیـز لـە بۆچوونو ڕەخنەکانیان دوودڵو نیگەران مەبە.

**دووەم:-** ئەگـەر (١٣ - ١٩) خاڵـت بەدەسـت هێنـا، ئـەوا دەگونجێـت تـۆ ببیت بە کەسـێکی بەئەزمـوونو داهێنەر، بەڵام هێشـتا لە سـەرەتای ڕێگەدایت، لەبـەردەم هەنـگاوی یەکەمی داهێنـانو ئەزمووندایـت، جارێکی دیکە، چاو بە هەڵسـوکەوتو بیرۆکـەو بەرنامەی ژیانتدا بخشـێنەرەوە، بۆئـەوەی بزانیت، تۆ بۆچی لەسـەرەتای ڕێگەدایت؟ کەواتـە هەنگاو بنێو بەردەوام بە، بەردەوامیت دەتوانێت بتگەیەنێت بە ئاستی کەسانی جۆری یەکەم.

**سـێیەم:-** ئەگەر (١٢) خـاڵ، یان کەمترت بەدەسـت هێنا، ببورە کە ڕاسـتەوخۆ پێت دەڵێین. کە تۆ کەسـێکی بەئەزموونو داهێنـەر نیت، ڕەنگە هۆکاری سـەرەکی، خودی خـۆت بیت، یان ژینگەو چواردەورت بن، یاخود هەردووکتان؛ واتە هەم خۆتو هەم ژینگەکەت بێت..

بـەڵام ئـەوە بزانە، ئیـدی دەرگاکان بـە ڕووی هەمووواندا دانەخـراون، دەتوانیـت بە گۆڕانـکاری لە جـۆری بیرکردنەوەو تێڕوانینـت بۆ ژیان، بگەیت بە ئاسـتی کەسـانی یەکەمو دووەم، بفەرمـوو: لێـرەدا ڕاو بۆچوونو سـەرنجی زانایانی شـارەزاو بە ئەزموونـت بۆ باس دەکەین، بۆئـەوەی بتوانیت ڕێژەی داهێنانو ئەزموون، لـە خۆتدا زیاد بکەیت، (پۆڵ تونـس) لە کتێبەکەیدا باس لە ناڕاسـتەکردن بـەرەو داهێنان دەکاتو ئـەم چەند خاڵە پێشنیار دەکات:-

١- ڕووبەڕووبوونەوەی ترسو دڵەڕاوکێ.

٢- سـوودوەرگرتن لـە هـەلو دەرفەتـە جیـاوازەکان، بۆ فێربوونو شارەزابوون.

٣ – وازهێنان لەخۆشـپرزەکردنو بەشـداربوون لە هەموو کارێکدا.

٤- پەرەپێدانی بەهرەو تواناکانت، تا ئەوپەڕی توانا.

٥- کەمکردنەوەی دووڕەپەرێزیو گۆشەگیریو نامۆیی.

٦- فێربە چۆن ڕووبەڕووی شکستو هەڵوێستە سەختەکانی ژیان دەبیتەوە.

٧- گرنگیدانی باش، بە کەسانی داهێنەرو چاودێریکردنیان.

٨- بەگیانی وەرزشی، ئامێز بۆ بیرۆکەی نوێ بکەرەوە.

٩- دەربڕینی هەستەکان، دەمەزەرد بکەرەوە.

١٠- درووسـتکردنی پاڵنەر بۆ داهێنان، چونکە پێداویستی، سەرچاوەی داهێنانە.



# بنەمای جیاکاری

چیا عەبدولا......بەشی دووەم

ئێستا ئایا سەرچاوەی ڕوانینمان بۆ شتەکان چییە؟

بەپێی بۆچوونی (د.جیمس ماکۆناڵ) نووسەری پەڕتووکی (تێگەیشتنی ڕەفتاری مرۆیی) دەڵێت:

(ڕوانینمان بەرامبەر شتەکانو لە باوەڕمانەوە هەڵدەقوڵێت).

بیر لەم وتەیە بکەرەوە، گەر تۆ ڕازیت لەکارەکەت، ئایا ڕوانینت بۆ کارەکەت چۆنە؟ خۆگەر پێچەوانەکەشی ڕاست بێت، ئایا ڕوانینت بۆی چۆنە؟ ڕوانینمان بۆ شتەکان لە بنەڕەتەوە، ئاکامی باوەڕەکانمانە، بەڵام ئایا دەتوانینو دەکرێت ڕوانینمان، بەرامبەر شتەکان بگۆڕین؟

وەڵامەکەی: بەڵێ، وەك (دینس ویکلی) لەپەڕتووتوکی (سایکۆلۆجیای سەرکەوتن)دا دەڵێت: (ڕوانینت بەرامبەر شتەکان، خۆت هەڵت بژاردووە، تۆ دەتوانیت بڕیار بدەیت، کە سوپاسی خەڵك بکەیت، تۆ دەتوانیت بڕیاری بەخشندەییو هاوکاری خەڵك بدەیت، تۆ دەتوانیت زیاتر تێگەیشتوو و لێبوردەبیت)، بەڕاستی ڕوانینت، بەرامبەر شتەکان هەڵبژاردنەو منو تۆ ئەنجامی دەدەینو دەتوانین بیانگۆڕین تەنها لەو ڕێیەی کە بڕیاربدەین خۆمان لە ژێر دەسەڵاتی خوددا ئازاد بکەین، (ئالبرت ئینیشتاین) دەڵێت: (نرخو ڕێزی ڕاستەقینەی مرۆڤ، بە ئاستی ئازادبوونی لە ژێر دەسەڵاتی خودیدا دیاری دەکرێت)، (ماریان ویلمسۆن) نووسەری پەڕتووکی (هێزی مرۆڤ) دەڵێت: (گەورەترین نواندن بۆ گۆڕینی جیهان، توانامانە لەسەر گۆڕینی ڕوانینەکانمان، بەرامبەر شتەکان).

بۆئەوەی ڕوانینێکی درووستت هەبێت بەرامبەر شتەکان، دەبێت خۆت بپارێزیت، لەم پێنج خاڵە نەرێنییە:-

١- لۆمەکردن:-

ڕۆژانە زۆرێك دەبینین کە لۆمەی یەکتری دەکەن، لۆمەی کەسوکار، بەڕێوەبەری کارەکان، تەنانەت لۆمەی قەدەریش دەکەن لەسەر بەدبەختییان، بگرە هەندێك کەس لۆمەی کەشو هەواش دەکەن، لەسەر ئەو هەستو شعورە نەرێنییەی هەستی پێدەکەن، بەداخەوە لۆمەکردنی بەرامبەر، ڕەفتارت زبر دەکاتو بچووکی دەکاتەوەو ڕێگریشە لەبەردەم بەگەڕخستنی توانا ڕاستەقینەکانت، من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە بەردەوام لۆمەی بەرامبەرم دەکرد، یەکەم لۆمەی باوکمم دەکرد، کاتێك بەتوندی سزای دەدام، لۆمەی مامۆستاکانم دەکرد، کاتێك لەوانەکان تێنەدەگەیشتم، لۆمەی هاوڕێکانم دەکرد، کە پەیوەندییان پێوە نەکردمایە، لۆمەی بەڕێوەبەری کارەکەمم دەکرد، لەسەرئەوەی کە دەست خۆشی لێنەدەکردم لە کارەکەمدا، لۆمەی خێزانەکەم دەکرد، لەسەر هەرشتێکی هەڵە ڕووی بدایە لە ژیانماندا، لۆمەی منداڵەکانم دەکرد، چونکە نیوەی شەو بەخەبەریان دەهێنامەوە، تا بچن بۆسەر ئاو، لە سەروو هەموو ئەمانەشەوە لۆمەی بەختی خۆمم دەکرد، کە چۆن کەوتوومەتە ناو ئەم هەموو شێواوییەوە، ڕۆژێکیان ئۆتۆمبیلەکەم لێدەخوڕی، گوێم لە وتاربێژێکی جیهانی گرتبوو، کە باسی (هونەری هاوسەنگی) دەکرد، دەیوت: کاتێك لۆمەی دەوروبەرو کاتو هەلۆێستت دەکەیت، ئەوا تۆ هێزێکیان پێ دەدەیت؛ کە لەناوبەرە، (واز لەلۆمەی خەڵك بهێنەو لێپرسراوبە بەرامبەر ژیانت)، ئەم ڕستەیە، وەك هەورەبروسکە دابەزییە سەر سەرم، بۆئەوەی بەئاگام بهێنێتەوە، لەو حاڵەی کە منی تێدام، ئیتر لەو کاتەوە لەبری ئەوەی لۆمەی خۆمو خەڵك بکەم، بەردەوام دەگەڕێم بەشوێن ئەو هۆکارانەی کە ژیانم باشتر دەکات، تۆش دەتوانیت ئەمە ئەنجام بدەیت، بەم شێوەیەش، زیاتر نزیك دەبینەوە لە سرووشتی ڕاستەقینەی خۆمان، چونکە گەر تۆ لۆمەکارێکی باش بیت، ئەوا درێژە دەکێشێتو دەبیت بە لۆمەکارێکی زۆر نایاب، واز لە لۆمەکردن بهێنەو سەرەداوی کارەکان بگرە دەستو بەشوێن ئەو ڕێگایانەدا بگەڕێ، کە ژیانت بەرەو باشتر دەبات، بەم ڕێگایەش، تووشی سەرسامی دەبیت، لەو هەموو ئارامیو ئاسوودەییەی کە تێیدا دەژی.



# لەناوچوونی ئەوانەی زیادەڕەوی دەکەن لەگوفتارو کرداردا

و: چیمەن لەتیف

(ئەحمەد زویل) هەلگری خەڵاتی نۆبڵە لە زانستی فیزیادا، لەبارەی گرنگترین خەسڵەتەکانی زانای ڕاستەقینە، پرسیاری لێکرا، چۆن بتوانرێت جیاوازی بکرێت، لە نێوان زاناو ئەوەی بانگەشەی زانین دەکات؟

وتی: هەرکەسێك باسی گەورەیی، توانا، زانستو پێگەیشتوویی خۆی کرد، گوێی لێ مەگرە، زانای ڕاستەقینە، چەند بە پەیژەی زانستدا سەربکەوێت، ڕووبەری نەفامی زیاتری لێ دەردەکەوێت، تێدەگات لە قەڵەمڕەویی خودای بەدەسەڵاتدا، چەند بچووکە! ئەو لەدەریای زانستو زانیندا تەنها پنتێکە!

چونکە گرنگترین زاراوەی پایەبڵندی ئەوەیە، خۆت بە فێرخوازێك ببینیت، لە قوتابخانەی ژیاندا، یەکەم خەسڵەتی گەورەپیاوان ئەوەیە: لەسەر ڕاستیی زانینەکانیان ڕادەوەستن، لەتوانایاندایە خوێندنەوە بکەن؛ بۆ مەودای پەیبردن بەشتەکانو تێگەیشتن لە دەوروبەر.

کاتێك خودای بەدەسەڵات، پێمان دەڵێت کە زانایان، زیاد لە گشت مەردم لەخواترسن، چونکە لەگەورەییو بەدەسەڵاتی پەروەردگار تێدەگەن، پەروەردگار پێمان دەڵێت، کە زانستوزانین دەرگای ڕاستی گەورەییو پایە بڵندییە بەشێوەیەك ﴿ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴾ یوسف: ٧٦. ئەوانەی شانازی دەکەن بەوەی هەیانە، لووتبەرزانە خۆیانی پێوە ڕادەنێن، ماوە ناماوەیەك، ئەوەی دەیزانن‌و هەیانە بەبیری کەسانی تری دەهێننەوە، لەڕاستیدا کەموکورتییەك لە پێکهاتەی دەروونیاندا هەیە، بێباوەڕن بەتوانای خۆیان لەوەی بەردەوام هەڵبکشێن، لەسەرووی ئەمانەوە پەینەبردنە بەگرنگترین ڕاستی، لە ڕێسای گەردووندا، ئەوەش کە زانستو ڕاستی‌و زانینی ڕەها، کەس خاوەنی نییە، گەورەیی تەنها بۆ خودایە.

ئەو کەسانە خۆیان بەزاناو پێگەیشتوو، خاوەن دارا دەبینن، لەوانەیە ڕۆژێك دابێت کەسێکی سادە، کە لە خەیاڵی ئەواندا نییەو هیچ حسابێکی بۆ ناکەن‌و ئاوڕی لێ نادەنەوە، ئابڕوویان بەرێت.

لەم نێوەندەدا، چیرۆکێکی ڕەمزیم بیرکەوتەوە، کە جیاوازیی نێوان دوو کەس دەردەخات، کەسێکیان بەزانین‌و ڕێزلێگیراوییەکەی لەخۆ بایبووە، کەسێکی تریش ڕۆژگار لەقەپێلکی خۆیدا گرمۆڵەی کردووە، سەرباری زیرەکی‌و دووربینییەکەی لەبیری کەسدا نییە.

ڕۆژێك منداڵێکی بچکۆلانە، خۆی کرد بە دوکانی سەرتاشێکدا، کاتێك سەرتاشەکە، منداڵەکەی بینی، بەگوێی ئەو پیاوەی لەژێردەستیدا بوو چرپاندی: ئەم زارۆکەیە، کاڵفامترین منداڵە لە دنیادا، ببینە، ئێستا ئەمەت بۆ دەسەلمێنم.

پاشان لە زارۆکە نزیك کەوتەوە لە دەستێکیدا بڕی هەزار دیناری دانابوو، لە دەستەکەی تریدا بڕی پێنج سەد دینار، پاشان بە منداڵەکەی وت: ژیکەڵەکەم، کامیانت گەرەکە! منداڵەکە پێنجسەد دینارەکەی وەرگرتو لێیدا ڕۆیشت...!

لێرەدا سەرتاشەکە، بەگاڵتە پێکردنەوە، زەردەخەنەیەکی کرد، بەو تاقیکردنەوەیە دڵخۆش بوو، قاقایەکی بۆکرد، بەپیاوەکەی وت: ناڵێم کەسێکی کاڵفامە؛ گشت ڕۆژێك هەمان کردەوە، دووبارە دەکاتەوە، بەشە کەمەکە دەباتو دەڕوات.

کاتێك پیاوەکە، تراشیان بۆ کردو قژیان ڕێکخستەوە، لە دوکانەکە، هاتە دەرەوە، منداڵەکەی بینی، لە دوکانی شیرینیفرۆشێك بەو بڕە پارەیەی لە سەرتاشەکەی وەرگرتبوو، پارچەیەك شیرینی کڕی، حەزی خۆ بردنەپێشەوە، بەسەر پیاوەکەدا زاڵبوو، پرسیاری لە زارۆکەکە کرد: بۆچی هەزاردینارەکەت وەرنەگرت، لەبری ئەوە دراوە کەمەکەت هەڵگرت؟ ئایا نازانیت، کە هەزار دینار گەورەترە لە پێنجسەد دینار؟

لێرەدا منداڵەکە، تەماشای نێوچاوی پیاوەکەی کردو وتی: ئەگەر ڕۆژێك بڕە زۆرەکە وەربگرم، یارییەکە کۆتایی دێت!!

بێفیزی ڕۆزیی پەروەردگارە، گەورەیی‌و لەخۆبایبوون داوی شەیتانە، چەند زۆرن ئەوانەی کەوتنە داوی لەخۆباییبوونەوە، دنیایان پڕکرد لەباسی (من‌و ئێمە)و بە بەکەمگرتن‌و گاڵتەکردن بە بەرامبەرەکەیان.

پێشەوا شافیعی پێمان دەڵێت (هەر کەسێك زیاد لەوەی هەیە باسی خۆی بکات» ناوی خۆی بهێنێت»، پەروەردگار دەیگەڕێنێتەوە بۆ بەهاڕاستەقینەکەی). بەڵام ئەوانەی زەبوونیان لەنێو باڵیاندا، پێچاوەتەوە.. بەڕاستی گەورەپیاوانن.

هاوڕێ، وەك ئەو سەرتاشە نەفامە مەبە، کە بەزیرەکیی پووچی، شانازی دەکرد، بە هەڵەی کەسانی تر دەخەنییەوە، بۆئەوەی لەژیاندا بە خەیاڵ نەژیت، لەولاشەوە خەڵکانی تر گەمەت پێ بکەن!

پوختە: بەڕاستی گەورەیی، تەنها خودا دەیزانێت، بەخۆتو زانستت، گومڕا مەبە، دەستی زەبوونی بگرە، پایەبڵندیی، شکۆداری‌و ڕێزلێگیراو دەبیت لەلایەن پەروەردگارەوە، بێ‌ئەوەی داوای بکەیت.

قادر حسن

# تەکنۆپۆلی، یان ملکەچی کەلتوور بۆ تەکنۆلۆژی

مێژووی مرۆڤایەتی، پڕیەتی لەسەرووەری میللەتان، کە هەمیشە وەك هۆکارێکی گرنگو میکانیزمێکی کاراو دیار، بەشدارییان کردووە لە بەرەوپێشبردنی کەلتوورو دەرکەوتنی شارستانێتی ئەو میللەتانە، کەوا لەناو هەر میللەتو کۆمەڵگایەکدا، تاکەکان هەڵسووکەوتو ڕەفتارو خوو و نەریتی تایبەت بە خۆیان هەبووە، کە ڕێزیان لێگرتووەو لەسنووری چالاکییەکانیاندا، هەوڵیانداوە پەرەی پێبدەنو بە زۆرترین کەسی بگەیەنن، تا سەرەنجام کۆی ئەو ڕفتارانە، یان هیچ نەبێت ئەوانەیان کەچانسی زیاتریان هەبووە بۆئەوەی زۆرترین ڕێکەوتنی لەسە ربکرێت، وەك کەلتوورێك لەناو میللەتاندا بناسرێن، لە کاتی پەیڕەوکردنیشیاندا، بۆ ئەو جۆرە کەلتوورە تامو چێژێکی تایبەتیان لێبینیوە، چونکە بە بەرهەمی ماندووبوونی چەندین ساڵەی خۆیان زانیوە، هەروەها بووەتە بەشێك لەکەلتووری میللەتەکە.

بەڵام: لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازیو بێنرخ تەماشاکردنی توانا جەستەییەکانی مرۆڤەکان، وەدەرنانی جوتیارو کرێکارەکان لە کێلگەو کارگەکاندا، جێگرتنەوەیان بەئامێرو کەرەستەپیشەسازییەکان، شانۆی ژیان، بوو بە گۆڕەپانێك بۆ ململانێی نێوان کەلتوورو فەرهەنگی میللەتان لە لایەكو پیشەسازیو تەکنەلۆژیای مۆدێرنە لە لایەکی ترەوە، ئەگەرچی بەهۆی بیروباوەڕی ئەو کاتەی خەڵکییەوە بەرامبەر بە هۆگرییان بە کەلتوورو فەرهەنگی خۆیان دژایەتییەکی زۆری ئەو حاڵەتە کرا، بەڵام سەرەنجام شۆڕشی پیشەسازی توانی شەڕەکە بباتەوە، ئەوەش بەهۆی ئەو پشتگیرییە زۆرەی دەوڵەتو سەرمایەدارەکانەوە بۆ شۆڕشی پیشەسازی، تەکنەلۆژیای مۆدیرنە، توانی سەربکەوێت بەسەر کەلتوورو فەرهەنگو جلوبەرگو ڕەوشتو هەڵسووکەوتو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگادا، بەمەش شارستانێتیی میللەتانی گۆڕی، بۆ میللەتێکی شارستانی، مۆراڵو ڕەوشتو کەلتووری باوی کۆمەڵگای گۆڕی، بۆ ئامێرە مۆدێرنەکانو هۆکارەکانی کۆمینوکەیشن.

تەکنۆپۆلی: واتە ملکەچبوونی کەلتووری گەلان بۆ ئەو کەلتوورە باوەی تەکنەلۆژیا، کە لە ڕێگەی جیهانگەرایییەوە ئاڕاستەی دەکات، ڕەحم بەهیچ کەلتوورێك ناکات، هەرچی هاتە بەردەم کۆنترۆڵی دەکاتو بەشێوازە مۆدیرنەباوەکەی خۆی دایدەڕێژێتەوە، بەبێ گوێدانە ناسنامەو ئاینو کەلتووری نەتەوەکان. بەکارهێنەران پێیان خۆشبێت، یان نا، دەبێت ملکەچ بن بۆ یاساکانیو جێبەجێیان بکەن، ئەگەرچی دژی مۆراڵو بنەماکانی مرۆڤایەتیش بێت، تەکنۆپۆلی ڕاناوەستێت لە ئاستێکدا، چونکە هەمیشە کەلتووری گلۆبال لەبەرەو پێشترچوندایەو سنورەکان ناناسێتو خۆی بە ئەلتەرناتیڤی تەواوی کەلتوورە جیهانییەکان دەزانێت، بۆیە لە هەوڵی بەردەوامدایە، بۆئەوەی تەواوی کلتوورەکان، ملکەچ پێبکات بۆ بنەماو یاساکانی خۆی.

زانای بەناوبانگی ئەمریکیو مامۆستای زانکۆی نیویۆرك نیل پۆستمان (neil postman) کە لە هەمان زانکۆ، وەك کۆمەڵناسو توێژەری بواری کۆمیۆنیکەیشن کاردەکات، دەڵێت: هەرگیز نامەوێت لە سوودو قازانجە زۆرەکانی تەکنەلۆژی کەم بکەمەوە، لە بوارەکانی پزیشکیو پەیوەندییەکانو ڕێگاوبانو فڕۆکەوانیو... هتد، بەڵکو ئەوەی منی نیگەران کردووە، ئەوەیە پەیدابوونو لەدایکبوونی هەر بەرهەمێکی مۆدێرنەو تەکنەلۆژی لەسەر حیسابی لەدەستدانی بەشێکی دیاری کەلتوورو بنەما ڕەوشتییەکانی کۆمەڵگا دەبێتو کەلتووری ئێمەی مرۆڤ ملکەچ پێدەکات، تا بتوانین ئەو تەکنەلۆژیایە بەکار بهێنینو سوودی لێوەر بگرین، هەر ئەم لێکۆڵەرە لە کتێبەکەیدا بە ناوی (the surrender of culture to technology) واتە: خۆبەدەستەوەدانی فەرهەنگ بە تەکنەلۆژی، دەڵێت: ئێمە ناتوانین تەنها لەبەر ئەو سوودو قازانجەی لە بەرهەمێکی تەکنەلۆژیدا دەستمان دەکەوێت، چاوپۆشی بکەین لەو زیانە زۆرانەی بەهۆی بەکارهێنانی بەرهەمە تەکنەلۆژییەکانەوە، پێمان دەکەوێتو مۆراڵو بەها مرۆییەکان لە ڕەفتارو گوفتارەکانمان دادەڕنێت.

لە تەکنۆپۆلیدا، تەواوی بەرهەمەکانی مۆدێرنەو پۆستمۆدێرنە ئەوەندە دەمارگیرن، تەنانەت بەزەییو سۆزیان، بەرامبەر بە بەرهەمە تەکنەلۆژییەکانی پێش خۆشیاندا نایەتەوەو بەسووكو بێنرخ سەیریان دەکەن، بەردەوام بە تیغو نەشتەری ڕەخنە لەبەرچاوی بەکاربەران سووکیان دەکەنو ناچاریان دەکەن کەدەست بەرداریان بنو بەرهەمە نوێیەکە بەکاربێنن، هەر بۆیە بەردەوام مۆدێلی نوێی بەرهەمەکانیان دەخەنە بازاڕەوە، بەخزمەتگوزاری جیاوازترەوە، تا بەرهەمەکەی پێشوو لەبەرچاومان سووك ببێتو تەنها بەشوێن ئەوەوە بین مۆدێلی مۆبیلەکانمانو ئۆتۆمبیلو خانوو کاتژمێرو جلو بەرگو...هتد، بگۆڕینو ئەوەی پێشوو وازلێبهێنین.

زانای بەناوبانگ هارۆڵدئینێس (Harold Inneis) کە بەباوکی لێکۆڵینەوەی بواری پەیوەندیکردنی مۆدێرن دادەنرێت، دەڵێت: تەکنۆپۆلیو تەکنولۆژیای مۆدێرن، ناتوانێت ئەخلاقی خۆی بپارێزێتو دەمارگیری نەنوێنێت، بەرامبەر بە بەرهەمەکانی، کاتێك بەرهەمێکی نوێ دەخاتە بازاڕەوە، هەوڵی سووککردنی بەرهەمەکانی پێش خۆی دەداتو وایپیشانی هاوڵاتیان دەدات، کە بەرهەمەکانی پێشووتر، نەیانتوانیوە مرۆڤەکان خۆشبەخت بکەن، بۆیە ئەم بەرهەمە نوێیەمان داهێناوە، تا مرۆڤەکانی پێ خۆشبەخت بکەین، ژیان بەبێ ئەم بەرهەمەی ئێمە هیچ تامێکی نییەو ئەو کەسانەی بە کەلتووری بەرهەمە کۆنەکە هەڵسووکەوت دەکەن، ناتوانن ببنە مرۆڤی مۆدێرنەو کەلتووری گلۆباڵ بیانگرێتەوە، تا ئەم بەرهەمە نوێیە بەکارنەهێنن، بەو شێوەیە، دەمارگیریان بۆ بەرهەمە نوێیەکەیان هەیەو کەلتووری خۆیان دەسەپێنن بەسەر هاوڵاتیانی دونیادا، چونکە ئەوان شارستانی بوونی مرۆڤەکان بە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژییەوە دەبەستنەوەو پلەبەندی بۆ دەکەن وەك (ئەمریکیو ژاپۆنیو کۆریو چینیو مالیزیو...هتد)، بەبێ گوێدانە ئەوەی هەندێ میللەت هەن، تەکنەلۆژیایان زۆر پێشکەوتوو نییە، بەڵام بنەما مرۆییەکانو بەهاکانی مۆراڵ لای ئەوان زۆر بڵاوەو ڕێزی مرۆڤ بە مرۆڤ بوونیەوەیەتی، نەك بەو ئامێرانەی کە بەکاریان دەهێنێت، کەچی لای ئەمان هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێتو بە دوواکەوتوو دادەنرێت.

هارۆڵد، لە کتێبەکەیدا بەناوی دەمارگیری هۆکارەکانی پەیوەندیکردن (the bias of communication) دەڵێت: یەکێك لە نامۆراڵییەکانی مۆدێرنە ئەوەیە، کە هەمیشە هەوڵی بێنرخکردنی تەکنیکەکانی پێش خۆی دەدات، تەکنیکە نوێیەکە بەباشترین پێناسە دەکاتو زاڵی دەکات بەسەر کەلتووری گەلانداو خاوەندارێتیی کەلتووریش دەبەستێتەوە بەو تەکنیکەوە، ئەوەبوو کاتێك تەلەفزیۆنی ڕەشو سپی داهێنرا، بەبەرهەمێکی نەتەوەیی دادەنرا، بەڵام پاش ماوەیەك کە تەلەفزیۆنی ڕەنگاوڕەنگ بەدوایدا هات، بە تەواوەتی ڕەشو سپییەکەی لەبەرچاوی بەکاربەرەکانی ناشیرین دەکردو ئەو کەسانەشی بەکاریان دەهێنا بە مرۆڤی نامۆدێرنو ڕەشپێست لە قەڵەمی دەدان، هەروەها بەرهەمەکانی تریش بەهەمان شێوە، بۆ نموونە (مۆبایل) لەگەڵ هاتنی بەرهەمو نەوەیەکی نوێدا ئەوەی پێشوو لەلای بەکاربەرانی بێبایەخ دەکات، بە هۆی ئەو خزمەتگوزارییە زۆرانەی کە تیایدا دادەنێنو تەواوی کەلتوورە باوەکان تێ دەپەڕێنێتو کەلتوورەکەی خۆی زاڵ دەکات، هەر ئەمەشە دەبێتە هۆکاری درووستبوونی ئەو هەموو دڵەڕاوکێو نەخۆشییە دەروونییانەی کە تاکی ئەورووپیو ئەمریکی بەرەو هەڵدێرو لەدەستدانی ئاکارو ڕەوشتەبەرزەکانو تەنانەت دزیکردن دەبات، بۆئەوەی بتوانێت لەگەڵ ئەو کەلتوورە باوەی تەکنۆپۆلیدا خۆی بگونجێنێت، تا بتوانێت مۆبایلێکی ئایفۆن، یان ئایپادێکی ئەپڵ، یان لاپتۆپێکی زیرەك بەدەست بهێنێت، تاوەك تاکێکی مۆدێرن دەربکەوێت، چونکە تەواوی کەلتووری گەلان، ملکەچی ئەو باوە ناپەسەندەی تەکنەلۆژیا بووە.

ئەوەتا کەسێکی تری وەك ئالان بلۆم (Alan Bloom) لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بەناوی (داخرانی زیهنی ئەمریکیەکان) دەڵێت: کچە خوێندکارێکی زانکۆ لە ئەمریکا، تا ئەو ڕادەیە کەلتوورو مۆراڵی نەتەوەیی خۆی لەدەست داوەو ملکەچی کەلتووری تەکنۆپۆلی بووە، لە ڕۆژێکدا چەند جارێك بۆی فرێندەکانی دەگۆڕێت، تەنها لەبەر گۆڕینی مۆدێلی مۆبایلو ئۆتۆمبیلەکانیان... بەڕاستی مرۆڤایەتی زیانێکی گەورەی بەردەکەوێت کاتێك: هەموو بوونو مۆراڵێکی کەلتووری خۆی لەبەرامبەر ئالەتێکی تەکنەلۆژیدا لەدەست دەداتو کەلتوورەکەی ملکەچی ئەو تەکنەلۆژیایە دەکات!

# پێشەوا ئیبن‌ولجەوزی

## (٥١١ - ٥٩٧کۆچی)

بەرزان ئەبوبەکر

پێشـەوا ئیبن‌ولجـەوزی، هەموو قورئانی پیـرۆزی لەبەربووە، خاوەنـی ڕاڤەی قورئانی پیـرۆزە، فەرمووده‌نـاس‌و مێژوونووس‌و زانای بەناوبانگی عێراق بووە.

نزیکـەی (٢٠٠) کتێبـی دانـاوە.. زانایەکـی بەناوبانـگو بەئەزموون بووە، خەلیفەو وەزیرەکان، پێشـەواو گەورەبەرپرسان، لە دانیشـتنەکانیدا ئامـادە دەبوون‌و گوێیان بـۆ ئامۆژگارییەکانی دەگرت، دەڵێن: هەندێجار لە کۆڕەکانیدا، سەد هەزار کەس ئامادەی دانیشـتنەکانی بوون، پێشەوا ئیبن‌ولجەوزی دەڵێت: بە پەنجەکانم دوو هەزار موجەلەدم نووسـیوە.. لەسەردەسـتی ئەو، سـەد هەزار کەس پەشـیمان بوونەتەوەو دەسـتیان لە تـاوان هەڵگرتووە.. هەر لەسەر دەستی ئەو، بیست هەزار کەس موسوڵمان بووە.

### پێشەوا ئیبن‌ولجەوزی: کێیە؟

ناوی (جمال الدين، کوڕی فەرەج، کوڕی عبدالرحمن)ە، لە شاری بەغداد لە سـاڵی (٥١١)کۆچی لەدایکبووە، لە تەمەنی سـێ سـاڵیدا باوکـی کۆچـی دوایی کـردووەو بەبێ باوکی گەورە بـووە، کۆچی دوایـی باوکی کاریگەری لەسـەر گەورەبوون‌و دەرکەوتنی پێشـەوا ئیبن‌ولجەوزی نەکردووە، پوری، واتە خوشـکی باوکی زۆر دڵسۆزانە هەموو سۆزو خۆشەویستییەکی پێبەخشی‌و زۆر بەجوانی چاودێری دەکردو ناردی بۆ مەڵبەندەکانی زانستو فێربوون..

هەرچەنـدە باوکـی لە تەمەنـی منداڵیدا جێـی دەهێڵێتو بۆ دواجـار ماڵاوایی لێدەکات، بـەڵام ئیبن‌ولجەوزی خۆی تەرخان کرد، بۆ فێربوونی زانسـتو زانیاری.. ئەو سامانەیشـی کە لە باوکییەوە بۆی جێمابوو، لە ڕێگەی فێربوون‌و زانستو زانیاریدا، خەرجیکرد.

لەبەرئەوە دەبینین، پێشـەوا ئیبن‌ولجەوزی، زیاتر لە کتێبێکدا باس لە ژیاننامەی خۆی دەکات، هەروەکو لە کتێبی "صيدالخاطر"دا دەڵێت:

هـەر کەسـێك هۆگری خۆشـی‌و شـادی بێـت، دەبێت سـۆزو خۆشەویسـتی بـۆ خۆی هەبێـت، من لـە خۆشـی‌و بەختەوەری نازونیعمەتدا گەورەبووم، کاتێك نازو نیعمەتو خۆشـی‌و شادی کەم بووە، شوێنەواری نەخۆشیم تێدا دەرکەوت، کە بوو بە هۆی دابڕانم لە زۆربەی پەرستشـەکان، من پێش نەخۆشییەکەم، هەموو ڕۆژێك پێنج جوزئم لە قورئان دەخوێند، بەڵام لە ڕۆژانی نەخۆشینەکەمدا، تەنانەت نەمدەتوانی قورئانیش بخوێنم، بە خۆمم گوت: پاروویەك بووەتە هۆی ئەوەی کاریگەری هەبێت، لەسـەر خوێندنەوەی پێنج جزء قورئان، کە خوێندنی هەر پیتێك دە چاکەت بۆ دەنووسرێت، لـە کاتێکدا خـواردن گوێڕایەڵییەکی گەورەیە، بـەڵام زۆرخواردن زیانێکـی گەورە بە جەسـتە دەگەیەنێت، مرۆڤـی ژیر، خواردنێك دەدات بە جەستەی کە دەگونجێت لەگەڵ جەستەیدا.

کاتێـك ئیبن‌ولجـەوزی گەورە بوو، هەسـتیکرد بـە خۆی کە پێویستە ئاوڕێ بداتەوە، بە لای فێربوونی زانستدا، قەناعەتی کرد کاتێك مرۆڤ دەیەوێت کارێك بکات، هەموو بەڵاو ناڕەحەتییەکانی لەسـەر ئاسـان دەبێت، لەبەرئەوە ورەبەرزی بۆ فێربوونی زانستو زانیـاری، بـوو بە هۆی ئەوەی هەموو کۆسـپو لەمپەرەکان لە یاد بکات، لای پێشەوا ئیبن‌ولجەوزی، فێربوونی زانستو زانیاری، لە بە تامترین بەتام خۆشـتر بوو، لەبـارەی خۆیەوە دەڵێت: ئەو کاتەی لە قۆناغی داواکردنی زانسـتدا، هەموو ناڕەحەتییەکانم فەرامۆش کـرد، جگە لە هەنگوین، شـتێکی دیکەم پێ نەبوو، لە پێناوی ئەو شـتەی داوای دەکـەمو دەمەوێت فێـری ببم.. لە بیـرم دێت ئەو کاتـەی لاو بـووم، کولێرەیەکی وشـکم بە دەسـتەوە گرتو بەڕێ کەوتم بۆ فێربوونی زانسـتی فەرموودە، لەبەردەم ڕووباری عیسادا دانیشـتم، نەمدەتوانی بەبێ ئاو، کولێرەکـە بخۆم، هەر پاروویەك کولێرەم دەخواردو قومێك ئاوم بەسەردا دەکرد، تەنها چاوم لەسەر فێربوونی زانسـتو زانیاری بوو، لەزەتم لە هیچ شتێك نەدەبینی، هێندەی بەدەستهێنانی زانیاری.

ئیبن‌ولجـەوزی هەر لە منداڵییەوە، بە وەرع‌و دونیانەویسـتی‌و خۆپارێزی ژیاوە، حەزی بە تێکەڵاویی خەڵکی نەدەکرد، لە ترسـی بەفێڕۆچوونـی کاتەکانی‌و کەوتنە نێو تاوانـەوە، بەردەوام خۆی‌و کاتو گیانی دەپاراسـت، پێشـەوا ئیبن کثير دەڵێت: ئیبن‌ولجەوزی هەرگیز تێکەڵاوی کەسـی نەدەکرد، هیچ خواردنێکی گومانلێکراوی نەدەخوارد، تەنها بۆ نوێژەکانی دەچووە دەرەوە.

### حەزکردن بە دابڕان:-

ئیبن‌ولجـەوزی، حەزی بـە دابڕان دەکردو تێکـەڵاوی خەڵکی نەدەکـرد، لە پێناوی پاراسـتنی کاتەکانی‌و نەکەوتنـە ناو گاڵتەو گەپـەوە، لـە "صيدالخاطر"دا دەڵێت: هیچ شـتێك لـە دونیادا بە ئەنـدازەی ژیانـی تەنیایی زانا بۆ زانسـتەکەی خۆشـترو چاکتر نییە، هاودەمی تەنیایی، قەناعەتی بە سەلامەتی دینەکەی لە شتە ڕێگـە پێدراوەکان، لە پێناو وازهێنـان لە تەکلیفکردن لە خەڵکی‌و لەدەستنەدانی ئاینەکەی، ڕازی بێت بە سەربەزی، لە زەلیلی دونیاو خەڵکی دونیا، قەناعەت بوون بە کەم، ئەگەر زۆری نەبوو، بەمەش دین‌و دونیای دەپارێزێت، سـەرقاڵبوونی بە زانسـتەوە، دابڕانی لە باخ‌و بێستان، بەڵگەیە لەسەر چاکەکاری.

سـەلامەت بوون لە شەیتان‌و دەسـەڵاتدارو خەڵکی بەگشتی بە

دابڕان بەدەستدێت، بەڵام ئەمە تەنها بۆ زانا دەگونجێت، چونکە ئەگەر کەسی ئاسایی خۆی لە خەڵکی دابڕێت، دەبێت بە کەسێکی خەمۆکو گۆشەگیر.

## ڕاوبۆچوونی زانایان سەبارەت بە ئیبنولجەوزی:-

زۆرێک لە زانا پایەبەرزەکان، بە کەسایەتی ئیبنولجەوزی سەرسام بوون، هەر بۆیە وەسفیان کردووەو بە کەسایەتییەکی کەم وێنەو لێهاتوو، باسیان لێوە کردووە، ئیبن خەلەکان لە بارەیەوە دەڵێت: ئەو عەلامەی سەردەمی خۆی بووە، لە زانستی فەرموودەدا پێشەوای سەردەمی خۆی بووە، لە زۆربەی هونەرەکانی ژیاندا شارەزا بووە، باسی لە چەند دانراوێکی کردووەو دەڵێت:- کتێبو دانراوەکانی ئەوەندە زۆرن، نزیکە نەژمێردرێن، بەدەستی خۆی شتی زۆری نووسیوە، زۆرێك لە خەڵکی دەڵێن: ئەگەر کتێبەکانی کۆبکەیتەوە لەگەڵ ماوەی تەمەنیدا، بەراوردی بکەیت، کتێبەکانی بەسەردا دابەش بکەیت، ئەوە هەر ڕۆژێك ٩ نامیلکەی بەردەکەوێت.

حافظی کوڕی دەبیثی دەڵێت: ئیبنولجەوزی قسەی لە هەموو خەڵکی جوانتر بوو، لە هەمووان ڕێکوپێکتر بوو، زمانی لە هەموو کەس شیرینتر بوو، تەمەنو زانستەکەی لێوان لێو بوو لە بەرەکەت، خەڵکی زیاتر لە چل ساڵ، گوێیان بۆ وتەکانی ئیبنولجەوزی گرت.

ئیبن کثیر ڕەحمەتی خودای لێبێت، دەڵێت: ئیبنولجەوزی تاقانە بوو، لە لێهاتوویی لە ئامۆژگاریکردنو بانگەوازدا، هیچ کەس پێشی نەکەوتووە، لە ڕێگەو ڕێبازو شێوەو ڕەوانبێژیو زمانپاراویو شیرینیدا بێوێنە بوو، زۆر بەجوانی لە مانای وشەکاندا ڕۆدەچوو، زۆر بەجوانی مانای وشەکانی لێك دەدایەوە، شتە نامۆکانی دەچوواند بەو شتانەی هەستی پێدەکرێت، تا بە ئاسانی بیسەر لێی تێدەگەیشت، بە شێوەیەك کۆمەڵێك مانای لە وشەیەکی سادەو ساکاردا کۆدەکردەوە.

ئیبنولجەوزی سەبارەت بە خوێندنەوەی خۆی دەڵێت: لە ماوەی ژیانمدا، زیاتر لە بیست هەزار کتێبی قەبارە گەورەم خوێندۆتەوە..

## قوتابخانەی ئیبنولجەوزی:-

ئیبنولجەوزی، ڕۆڵێکی گەورەو بەرچاوی هەبووە لە خزمەتکردنی کۆمەڵگەدا، قوتابخانەو کتێبخانەیەکی گەورەی دامەزراندووە، کتێبەکانی کردووەتە وەقف، واتە هەموو کەس مافی هەیە بەکاریان بهێنێت..لە چەندین قوتابخانەی شاری بەغداد وانەی وتۆتەوە.

## پلەو پایەی لە ئامۆژگاریو وانە وتنەوەدا:-

هەوڵو تێکۆشانی ئیبنولجەوزی، تەنها لە قەڵەمەکەیدا کۆ نەبووەوە، دانراوەکانی پلەو پایەو ناوبانگێکی گەورەیان هەبوو، هەروەها ئامۆژگاریو بانگەوازو ڕێنموونی خەڵکی تایبەتو گشتی لە کارە پێشینەکانی بوو.

لە پێناوی خودا لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەترسا، خەلیفەو کاربەدەستانو دەسەڵاتداران لە وانەکانیدا ئامادە دەبوون. جارێکیان لەو کاتەی وتاری دەدا، ئاوڕی دایەوە بە لای خەلیفە (المستضیء العباس) وتی: ئەی فەرمانڕەوای باوەڕداران، ئەگەر قسە بکەم ئەوە لە تۆ دەترسم، بەڵام ئەگەر بێدەنگ بم، دەترسم بەڵایەکت بەسەردا بێت، ئەگەر پێیان وتی: لە خودا بترسە، زۆر لە کەسێك چاکترە، کە پێت دەڵێت: ئێوە ئالوبەیتو خودا لێتان خۆشبووە، هەروەها وتی: خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت: ئەگەر کرێکارێك، لە ستەمێك ئاگاداری کردمەوە، منیش نەمگۆڕی، واتە مافی ستەمکارم وەرنەگرتەوە، ئەوە من ستەمکارم!!

ئیبنولجەوزی، هەمیشە بەرگری لە حەقو ڕاستی کردووە، بەبێ ترس لە لۆمەی لۆمەکاران، هەمیشە دژایەتی بیدعەو خراپەو تاوانی کردووە، دژی دەمارگیری مەزهەبەکانو گوێڕایەڵی کوێرانە بووە، لەم بوارەشدا سەرکەوتوو بووەو خەڵکی دانیانناوە بەوەی کە لەو بوارەدا کەسێکی سەرکەوتوو بووە، خۆی دەڵێت: (خەڵکانێك دەرکەوتن قسە لەسەر بیدعەو دەمارگیری بۆ مەزهەبەکان دەکەن، خوای گەورە یارمەتی دامو سەرکەوتین بەسەریاندا، وشەو بۆچوونەکانی ئێمە بەرزبووەوە، بەسەر بۆچوونو قسەکانی ئەواندا، بێگومان لەبەرئەوەی ئەو لەسەر حەق بووە).

## نارەحەتیو دەردەسەرییەکانی لە پێناوی حەقو ڕاستیدا:

ئیبنولجەوزی لە کۆتایی تەمەنیدا تاقیکرایەوە، ئەویش وەزیری کوڕی یونسی حەنبەلی لە ویلایەتەکەی خۆیدا بە ئامادەبوونی ئیبنولجەوزیو چەندین زانای دیکە، کۆڕێکی سازکرد بۆ ڕکن عبدالسلامی کوڕی عبدالوهاب، بڕیاریاندا کە هەموو کتێبەکانی بسووتێنن، کتێبەکانی سەبارەت بەبێ دینیو ئەستێرەپەرستیو بۆچوونەکانی ئەوائیلو چەندین شتی دیکە بوو، وەزیر قوتابخانەکەی باپیری لێ سەندەوەو تەسلیمی ئیبنولجەوزی کرد.

بەڵام دوای ماوەیەك (ابن القصاب) کە پشتیوانی لە ابن عبدالسلام دەکرد، هەوڵی دەستگیرکردنی وەزیر یونسو هاوەڵەکانی دا، ڕکن وتی: ئیبنولجەوزی لە کوێیە؟ ئەو لە گەورە هاوەڵانی کوڕی یونسە، وەزیر قوتابخانەکەی باپیرمی بەخشیوە بە ئیبنولجەوزی، سەرجەمی کتێبەکانی منی بە ڕاوێژی ئەو سووتاند.. ئیبن قەصاب نامەیەکی نارد بۆ خەلیفە ناصر، کە مەیلی بەلای تەشەیوعدا هەبوو، تێیدا نووسیبووی کە ئیبنولجەوزی تەسلیمی ڕکن عبدالسلام بکات، ئەویش ڕۆیشت بۆ قوتابخانەکەی ئیبنولجەوزیو قسەی ناشیرینی بە زانای پایەبەرز وتو سوکایەتی زۆری پێکرد، قوتابخانەکەی داخستو شوێنکەوتووانی بڵاوە پێکرد، پاشان سواری کەشتییەکی کردو بردیی بەرەو شاری واسط لە ماڵێکدا زیندانی کرد، ئیدی خۆی جلوبەرگەکانی دەشۆریو چێشتو نانی دروست دەکرد، ماوەی پێنج ساڵ بەوشێوەیە مایەوە..

چەندین نارەحەتیو دەردەسەری ڕووی تێکرد، بەڵام ئارامگرتنو وەرەبەرزیو خۆڕاگریو وەستان لە ڕووی ستەمکارو ملهوڕان، لە نەریتی زانایانو تێکۆشەرانی دڵسۆزو پایەبەرز بووە.

زانای پایەبەرز لە ماوەی ژیانیدا، زنجیرەیەك هەوڵی بەردەوامی داوە، بۆ دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان زانستو کارکردن بەزانست، بە پەیوەندییەکی بەهێزو پتەو.

لە کتێبی "صید الخاطر"دا لە ژێر ناونیشانی (العلماء العاملون) وەسفی ئەو زانایانەی دەکرد کە شایستەی وەسفن، زەمی ئەوانەش کە شایستەی زەمکردنن..



# جەژن و قوربانی..

جەلال عەبدوڵا حاجی

هەموو ساڵێك، پێش جەژنی قوربان، خەڵكی لە هەرێمی كوردستاندا، پێویستییەكانی تایبەت بە جەژن دەكڕن، لە ڕۆژانی جەژنیشدا، بۆ دەستكەوتنی خێرو پاداشت، قوربانییەكی زۆر دەكەن. بەم كارەیان، ئاشكرای دەكەن، كە لە بیروهزری ئەواندا، تەنها خودایەك هەیە، شیاوی پەرستنو قوربانییە، لە كاتێكدا خوێنو گۆشتەكەی بۆ ئەوانەیە، كە لەسەر زەویدا دەژین. ئەوەی جێگەی سەرنجە، گۆشتی قوربانییە (كۆ گۆشت، بەشە گۆشت)، هەرچەندە خەڵكانێكی زۆر هەن، پێویستیان بەو پشكە گۆشتە نییە، دەبینین بە گەیشتنی بۆ هەرماڵێك، پەیامی بەسەركردنەوە، پتەوكردنی پەیوەندی، گەرموگوڕتركردنی جەژنو دوعای خێر لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، هەموو كەسێك شیاوی دیاریو بەسەركردنەوەیە، هەرچەندە بەشتێكی بچووكیش بێت. هەربۆیە، ئەگەر قوربانی لە گەڕەكێكدا بكرێتو بۆ ماڵێك نەڕوات، ڕەنگە دلگران بێت.

خوای گەورە خێرو قوربانی ئەوكەسانە قبوڵ بكات، كە لە ڕۆژانی جەژندا قوربانی دەكەن، ئەم ساڵ جیاوازە لەساڵەكانی تر، چونكە خەڵكانێكی زۆر لە هەرێمەكەماندا، كەمدەرامەتو ئاوارەو بێلانەو كرێچین، ئافەرین بۆ كەسێك بتوانێت، لە تەنگانەدا بەخشندەبێت، ئێستا كاتی دەركەوتنی دڵە ساغەكانو ئیمانە خاوێنەكانە.

ئەوەی دەبێت، لە ڕۆژانی جەژنداو لەكاتی قوربانیدا، ئاگامان لێبێت، خاوێنڕاگرتنی ژینگەیە، خەڵكی پێداویستیو خۆراكێكی زۆر بەكاردەهێنن، بۆیە خۆڵو خاشاكێكی زۆر كۆدەبێتەوە. هەر كەسێك بەنیازی قوربانیكردنە، پێویستە بیر لەوە بكاتەوە، بەجوانترین شێوە ئەنجامی بدات، چۆنێتیی قوربانیكردن گرنگە، هەندێجار دەبینین لە كەنار ڕێگەو كۆڵانەكاندا، قوربانی دەكەن، وا باشە ئەگەر كەسێك شوێنو جێگەی نییە بۆ قوربانیكردن، قوربانییەكە لەشوێنی تایبەت بەو كارە بكاتو پاشان گۆشتەكەی بهێنێتەوە ماڵەوەو دابەشی بكات، بەم كارە ماڵەوەو گەڕەكو شارەوانی لەزۆر گرفت ڕزگاریان دەبێت، ڕەنگە قوربانیكردن لە نێو ماڵاندا، بەتایبەت لەشارە گەورەكاندا، هۆیەكەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، هەندێك كەس وا دەزانن، تا خوێنی ئەوقوربانییە بەچاوی خۆی نەبینێتو حەوشەی ماڵەوەیان نەبێت بە خوێنەوە، قوربانییەكەی قبوڵ نییە، بیر لەوە ناكاتەوە، دەبێت دواتر خاوێن بكرێتەوەو ئاوێكی زۆری دەوێت بۆ خاوێنكردنەوەی، ئەوبەشەی قوربانییەكەش بەكارنایەت دەبێت فڕێ بدرێت، لەبندیوارو كەنار ڕێگەكان هەڵی دەڕێژن، ئەمەش بۆنی ناخۆشو دیمەنێكی ناشیرین، بەو شوێنە دەدات، دواتر دەبێت شارەوانی كۆی بكاتەوە، دەبینین لە كارێكی پڕخێرو پیرۆزەوە، دەبین بەهۆی بارگرانی بۆ خەڵكانی تر.

جەژن بەخششێكی خواییە، بۆ خاوێنبوونەوەی دڵەكان.. هەلێكە، بۆ گەرمكردنەوەی پەیوەندییەكان. لەجەژندا هەنگاو دەنێین بەرەو ئەو ماڵانە، ئەو دڵانەی بەهۆی سەرقاڵبوونمان بە دنیاوە، لەبیرمان كردوون، تۆزی گلەییو بێڕەحمی لە خۆمان دەتەكێنین. لە جەژندا، خێروخۆشی، هەموو كوچەو كۆڵانەكان دەگرێتەوە، خەڵكی بەجۆرێكی تر ڕەفتار دەكەن، منداڵان بە ماڵاندا دەگەڕێن، هەموو ماڵەكانی گەڕەك، بەخزمی خۆیان دەزانن، وەكو هەنگ، كەوتونەتە نێو ماڵە پڕ لە شیلەكانەوە، بۆ كۆكردنەوەی شیرینی، جلی نوێو ڕەنگی نوێ، هەموو كەسێك ئامادەیە، بۆ سڵاوو گەردن ئازادی، چ بەخششێك لەمە گەورەترو جوانترە، جەژنتان پیرۆزبێت.. یاخودا هەر لە جەژنو شادیدا بن، گەردنتان ئازاد..

ئالانی

# نیوتن..

## ئاکە پیاوی فیزیایی، کەکەس لە ئێمە نییە ناوی نەبیستبێت!



نیوتـــن، ئەو زانایەیە کــە تا ئێســـتاش، بیردۆزەکانی بوونەتە بناغەی زانســـتی فیزیا؛ فیزیا ئەو زانســـتەیە کە ســـەرکردایەتیی ســـەرجەم زانســـتەکان دەکات. لە ســـەردەمی ڕاپەڕینی زانســـتیدا، زانستی فیزیا بوو بە هۆی دەرهێنانی ئەوروپا، لە سەردەمی تاریکی بۆ ســـەردەمی پێشـــکەوتنو شارســـتانێتی، کە چەندین سەدە بوو، ئەوروپا بەدەست دواکەوتوویییەوە دەینالآند.

نیوتن کێیە؟ بۆچی دکتۆر (مایکڵ هارت) وەکو دووەم کەسێتیی جیهان، کە کاریگەرییان لەسەر مرۆڤایەتی هەبووە، لە کتێبەکەیدا ناوی تۆمار کردووە؟

لە ٢٥ دیسەمبەری ساڵی ١٦٤٢، لە هەمان ئەو ساڵەی کە گالیلۆ، کۆچی دوایی کرد، نیوتن زانای فیزیایی لە کێڵگەیەك، کە هەشـــت میـــل لە کرنتـــام، کە پێـــی دەوترێ (ولســـن پورب)، لـــە ناوچەی لینکولنشـــایر، لەدایکبووە، نیوتن لە ســـکی دایکیدا بوو، کە باوکی کۆچی دوایی کرد.

قۆناغی خوێندنی ئامادەیی لە قوتابخانەی (گراهام) تەواو کرد، هەر لە منداڵییەوە، زیاتر لە خوێندنو قوتابخانە، هۆگرو شەیدای دروستکردنی ئامێری میکانیکی بوو..

نیوتن لە تەمەنی ١٤ ســـاڵیدا، وازی لە خوێندن هێنا، بۆئەوەی هـــاوکاری دایکـــی بکات، لە کاروباری کێڵگەکەیکـــدا، بەڵام هەر زوو دەرکەوت، کە نیوتن بۆ کاروباری کشـــتوکاڵی دەســـت نادات، چونکە نیوتن توانی؛ بە ســـەرنجدان بە مەودای بازدان لەگەڵ بادا، یان بە پێچەوانەی با، هێزی با بپێوێتو بیدۆزێتەوە.

نیوتن، توانی کاتژمێرێکی ئاوی درووســـت بکات، نەخشەی بۆ دوو کاتژمێری هەتاویش کێشـــا، کە تا ئێســـتاش وێنەی یەکێکیان لە کتێبخانەی زانکۆی شـــاهانەدا بوونی هەیە، لەگەڵ ئەوەشـــدا کە نیوتن وازی لە خوێندن هێنا، کاتێکی زۆری بۆ خوێندنەوە تەرخان کردبوو. دواتریش گەڕایەوە بۆ خوێندن.

نیوتـــن، پەیوەندی کرد بە زانکـــۆی (ترنیتی) لە کامبریدج لە ساڵی ١٦٦١ زایینی، بەڵام توانا ناوازەو تایبەتەکانی لە کاتی خوێندن لـــە زانکۆ دەرنەکەوت، کاتێك لە ســـاڵی ١٦٦٥ بە پلەیەکی ئاسـایی کۆلێـــژی تەواو کرد، گەڕایەوە بۆ کامبریدج وەکو ئەندامی کۆلێژی ترینیتی.

### دۆزینەوەو داهێنانەکانی نیوتن:-

یەکەم کەس بوو، کە باســـی کێشکردنی گەردوونی کردووە، نیوتن ســـەرەڕای ئەوەی زانایەکی فیزیایی بووە، شـــارەزایی باشـــی لە بواری فەلســـەفەو کیمیاگەریدا هەبووە، یەکـــەم دۆزینەوەو داهێنانی نیوتن، بیردۆزی هاوڕێژەیی جەبری بوو، کاتێك نیوتن تەمەنی گەیشـــتە ٢٤ ساڵی، توانا بێ سنورەکانی لە زانستی بیرکاری دا وەدەرکەوت..

لە ســـاڵێ ســـێیەم لە کامبریدج دەســـتی کرد بـــە لێکۆڵینەوە؛ لە خەرمانەی چواردەوری مانگو پێوانەی گۆشـــەکانی، بەڵام دوای بڵاوبوونەوەی تاعونو گەیشـــتنی بە کامبریـــدج، دەرگای زانکۆکە، بەتەواوی داخرا!

نیوتن، گەڕایەوە بۆ شـــارەکەی خـــۆی، چەندین مانگی تەرخان کـــرد، بـــۆ چارەســـەرکردنی گرفتە جۆراوجـــۆرەکان، بـــە تایبەت پشتڕاســـتکردنەوەی بۆچوونەکانـــی زانـــا (کیبلـــەر) ســـەبارەت بە سووڕانەوەی هەسارەکان بە دەوری خۆردا!

بـــەڵام چیرۆکی کەوتنە خوارەوەی ســـێوەکە لە درەختەکە، کە لە لایەن ڤۆڵتێرەوە گێڕدراوەتەوە، بیرۆکەی کێشـــکردنی پێشکەش کرد، ئەمە بووە وەڵامی ئەو گرفتە، نیوتن بووە داهێنەری یاســـای کێشکردن.

گوڵان حەمەئەمین



# چۆن منداڵەکەت فێری چاکە دەکەیتو لە خراپە دووری دەخەیتەوە؟

گەشـەی ڕەوشـتیو فێرکردنی چاکردنەوەی ڕاستو هەڵە لەم قۆناغەوە دەست پێدەکات، پێویستە منداڵەکەت ڕابهێنی لەسـەر ناسـینی چـاكو ئـاکاری ڕێگەپێدراو، دوورکەوتنـەوە لە خراپو قەدەغەکراو، بەشـێوەیەکی ڕوونوئاشـکراو قوڵتـر لـە جـاران. لـەلای (کولبیری) پێگەیشتنی ڕەوشتی بەسێ قۆناغ دەبێت:-

١- لـەم قۆناغـەدا منـداڵ نەرێنییـە، دەترسـێت لە سـزا، دڵخۆش دەبێت بە پاداشـت، پێویسـتە لێرەدا بەهاڕەوشتییەکانی پێبگەیەنیتو فێری بکەیت بەهەردوو ڕێگەی پاداشـتو سـزا، لەم قۆناغەدا قورسـە لەسەری تێگەیشتن لە بناغەی بەهابالاکانو ڕەوشتەبەرزەکان.

٢- دەسـتگرتن بـەو یاسـا ڕەوشـتە بەرزانەی کە کۆمەڵگا پەیوەسـتە پێوەی، ڕاهێنانی لەسەر ئەوەی کە بە تەواوی قەدەغەیە.

٣- ڕەوشـتە پەسـەندەکانی دەوروبـەر، ئەمـەش بەکاریگـەری هـەردو قۆناغـی یـەكو دوو، کاریگەری تەواو جێدەهێڵێت لە ناخو هەسـتو ڕەوشـتی منداڵدا. تـاڕۆژ لە دوای ڕۆژ منداڵ گـەورە دەبێتو بەرەو مێرد منداڵـی دەڕوات، دیاریکردنـی بەها ڕەوشـتییەکان لای ئـەو دەگۆڕێـت لەژێر کاریگەری ئـەو ژینگەیەی ئەوی تێدادەژی. بۆ هاوڕێبـوونو نزیکی زیاتر لەگەڵ منداڵدا، وادەکات ئەوەی تۆ پێی دەڵێیت ڕاست، بەڕاستی بزانێتو ئەوەی تۆش پێی دەڵێیت هەڵە، بەهەڵەی بزانێت.

دواتر نیوتن بۆ ماوەی دووسـاڵ ١٦٧٠ – ١٦٧٢ لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕی لەسەر زانستی بینین، زانی ئەنجام داو توانی بۆچوونەکانی بە ڕێگەی زانستی بسەلمێنێت..

نیوتـن، وەکو زانایەکـی بیرکاریی ناودار، دانـی پێدا نرابوو، وەکو نموونەیەك لە کۆلێژەکـەی دانرابوو، جێگە پەنجەی نیوتن لەلایـەن ئەندامانی یەکگرتـووی ئیمپراتۆری کـە (هۆن ڕۆبێرت برێل) دایمەزراندبوو، دواتر لە زانکۆی لەندەنی شـاهانە ناسێنرا، بۆ برەودان بە زانستی سرووشتی.

دوای ئەوە چەندین نوسراوی نووسی بۆ لێکۆڵینەوەکانی زانکۆ، وەکو توێژینەوە بڵاوکرایەوە.

لقێکـی نوێـی داهێنا لە بەشـی بیرکاری، کـە ناودەبرێت بە (جیـاکاریو تـەواوکاری).. سـەرجەمی ئەم داهێنانـەی نیوتن ١٨ مانگی خایاند، واتە: لە ساڵی ١٦٦٥ تا ساڵی ١٦٦٧ زایینی.

**ژیانی گشتیی نیوتن:-** نیوتن لە ژیانی گشتیدا کەسێکی چالاك بـوو، دوای بڵاوکردنـەوەی دانراوەکـەی «بنەمـاکان»، نیوتن لە ژیانیدا ژنی نەهێناوە، هیچ کەسی لە پاش خۆی جێ نەهێشتووە.

نیوتـن هیچ کات لـە ژیانیدا، سـاماندارو دەوڵەمەند نەبووە، کاتێك هاوەڵانی چواردەوری هەستیان کرد، بەکەمی داهاتی نیوتن، کاندیدیان کرد بۆ بەڕێوەبەری فوتابخانەی (مێنت) لە ساڵی ١٦٨٩ بە دەسەڵاتی لورد هالیفاکس، نیوتن لە کارەکەیدا وەکو بەڕێوەبەر مایەوە، تا ئەو ساتەی ماڵاوایی لە ژیان کرد.

نیوتن خاوەنی چەندین سـیفاتی سـادەو ساکار بوو، کەسێکی خاکیو بێفیز بوو، کە تایبەتمەندی کەسـە بلیمەتەکانە، ئەوانەی لـە خۆیـان بایی نابـنو خۆیـان بە گـەورە نازانن، لـە هەموو سەردەمێکدا، دەبن بە پاڵەوان.

نیوتـن دەبێت بە پارێزگاری سـکەی دراو، لە سـاڵی ١٦٩٦، لە سـاڵی ١٦٩٩ دووبارە بووە بە ئەندامی ئەنجومەنی زانکۆی شاهانە، هەروەهـا یاریدەدەر لە ئەکادیمیای فەرەنسـی.. پاشـان بۆ جاری دووەم، ساڵی ١٧٠١ هەڵبژێردرا بۆ پەرلەمان لە زانکۆ، دواتر بووەتە سەرۆکی زانکۆی مەلەکی لە ساڵی ١٧٠٣.

**تایبەتمەندییەکانی کەسـایەتی نیوتـن:-** نیوتـن هەرگیـز چێژی لە مشتومڕ سـەبارەت بە دۆزینەوەو داهێنانەکانی زانستی نەدەبینی، کاتێك بیردۆزە زانسـتییەکانی ڕادەگەیاند، ڕووبەڕووی بەرهەڵسـتکارییەکی تونـد دەبوویەوە، نیوتـن نەیدەتوانی کە لە ڕەخنەگرتن ڕزگاری ببێت، نیوتن زۆر هەستیار بوو، بەرامبەر ئەو ڕەخنانەی ناڕاستەی دەکران، تەنانەت هاوڕێکانی داوایان لێدەکرد، دۆزینەوە گرنگەکانی بڵاوبکاتەوە.

نیوتن بەشـێك لە ژیانی، بۆ لێکۆڵینەوەو خوێندنی بیرکاریو فیزیاو گەردووناسی بەسەر برد.

نیوتن لە پێش مردنیدا وتی: دەزانم چۆن بۆ جیهان دەردەکەوم، بەڵام سەبارەت بەخۆم، من منداڵێك بووم لە کەناراوەکانی دەریادا، یاریم دەکرد.

ئەنیشـتاین دەڵێـت: ئەو بیرۆکانـەی کە نیوتن، لـە فیزیادا پەرەی پێدان، تا ئەمڕۆش، بەبەردەوامی لە بیرماندا دادەگیرسێت.

نیوتن ساڵی ١٧٢٧ کۆچی دوایی کردووە.

# کەمەندکێشکردنی دڵو دەروونی خەڵکی

هەمووومان بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتانەی کە دەمانەوێ بە دەستیان بهێنین، پێویستمان بە هونەرو لێزانینو شارەزایی هەیە، پێویستمان بە پلاندانانو ڕێکستنی کاروبارەکانی ژیانی ڕۆژانەمان هەیە، بۆئەوەی ئەو ئامانجو مەبەستەی کە هەمانە بیهێنینەدی، بۆیە گرنگترین شتێك کە بمانەوێ بە دەستی بهێنین دڵو دەرونی خەڵکییە، چونکە هەر کارو کردەوەیەك کە ئەنجامی دەدەین بەرامبەر خەڵکی، ئەوا کاریگەرییەکی زۆر بە جێدەهێڵی لەسەر کەسی بەرامبەر، بەدەستهێنانی دڵو دەروونی مرۆڤەکان پێویستی بە خۆشەویستیو لێبووردنو یارمەتیدانو ڕێزگرتنو مامەڵەکردنی جوان هەیە، مرۆڤ هەرچەندە دەوڵەمەند بێت، بەڵام ئەگەر کەسایەتییەکی باشی نەبێت ڕووخۆشو دەم بەخەندەو نەرمونیان نەبێت، ئەوا ناتوانێت ڕەزامەندی بەرامبەرەکەی بە دەستبهێنێت، لەوانەیە بتوانێت بە پارە زۆر شت بەدەستبهێنێت، بەڵام هەرگیز ناتوانێت بەختەوەریو دڵودەروونی مرۆڤەکان بە بەردەوامی بە دەستبهێنێت، با پێکەوە ئەم نموونەیە بخوێنینەوە:-

مامۆستایەکی زانکۆ وتی: یەکێك لە خوێندکارەکانم کە لە کۆلێژ دەیخوێند، تووشی نەخۆشییەکی دەروونی هاتبوو، باوکی ئەم خوێندکارە ئەفسەرو پایەدارو دەوڵەمەند بوو، چەند جارێك هات بۆ سەردانمان بۆ کۆلێژ، بۆئەوەی لە چارەسەری کوڕەکەیدا هاوکاری بکەین، منیش بڕیارم دا ڕۆژێك سەردانیماڵیان بکەم، کاتێك چووم بۆ ماڵیان، بینیم خاوەن کۆشكو تەلارێکی ناوازە بوون، کۆڕو دانیشتنی باوکیشی، لێوان لێو بوو لە میوانو دۆستو ناسیاوەکانی، ژووری میوانەکەی زۆر گەورەو فراوانو دلگیربوو، بەڵام جێگەیەکی چۆڵت نەدەبینی کە تێیدا دابنیشی، بە ڕاستی سەرسام بووم بەوەی کە خەڵکی تا ئەو ئەندازەیە ئەم پیاوەیان خۆشدەوێتو ڕێزی دەگرن..

چەند ساڵێك تێپەڕیو باوکی خوێندکارەکە خانەنشین کرا، جارێکی تر سەردانم کردنو چومەوە بۆ ماڵیان، بۆ ناو کۆشكو تەلارەکەیان، بینیم دیوەخانەکەیان زیاتر لە پەنجا کورسی تێدایە، بەڵام بەداخەوە  تەنها کەسێکی لێبوو ئەویش سەیری بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی دەکرد، لەگەڵ خزمەتگوزارێك کە چاو قاوەی دەهێنا، کەمێك دانیشتمو هەستام ڕۆیشتم بیرم لەو کاتەی دەکردەوە کە خانەنشین نەکرابوو، ئەو کاتەی کە خاوەن پلەو پایەیەکی بەرز بوو، پارەو سامانی باشی هەبوو، ئێستا دەبینم دیوەخانەکەی چۆڵو هۆڵە!!

ئێستا دەپرسین لە ڕابوردوودا چی ئەو خەڵکەی لەو ماڵەدا کۆکردبۆوە؟! هەستم بەوە کرد، ئەو پیاوە بە هۆی ڕەوشتو هەڵسووکەوتی جوانییەوە، نەیتوانیبوو خەڵکی لە دەووروبەری خۆی کۆبکاتەوە، بەڵکو ئەو خەڵکەی بە هۆی پلەو پایەکەیەوە لە دەوری خۆی کۆکردبۆوە، کاتێکیش خانەنشین کراو پلەو پایەکەی نەما، خۆشەویستیو قەرەباڵغییەکەش نەما.

ئەوە یاسای ژیانە ئەگەر ژیانمان بە لایەنە مادییەکانەوە ببەستینەوە، ئەوا لەگەڵ نەمانیدا ئەویش بوونی نامێنێت، بەڵام هەڵسوکەوتو ڕەفتارو لایەنە مەعنەوییەکانی ژیان، شوێنەوار لەسەر دڵو دەروونی مرۆڤەکان بە جێدەهێڵێ، بۆیە با هەمیشە هەوڵبدەین لەسەر تەختی دڵەکان خۆمان داکوتین، نەك لەسەر تەختی کۆشکە مەرمەڕەکان.

هیوادارم بتوانین بە ڕەوشتو ئاکاری بەرزو مامەڵەی جوانو مرۆڤ دۆستانە، خەڵکی لە دەوری خۆمان کۆبکەینەوەو ڕێزو خۆشەویستیان بەدەستبهێنین، نەك بە پارەو سامانو پلەو پایە..

کارزان عوسمان





# منداڵو ئەتەکێت!

بێگەرد فارس

پێویستە لەسەر ئێمەی باوان منداڵەکانمان فێری ڕەوشتی جوانو پەسەند بکەین، بەڵام پێش دەرکردنی هەر فەرمانێك، پێویستە ئەو ڕەوشتەی دەیسەپێنین بەسەر منداڵەکانمان لە خۆماندا بوونی هەبێتو ڕەنگی دابێتەوە، بە مانایەکی تر دەتوانین بڵێین بۆ گەیاندنی هەر پەیامێك پێویست بە وتن ناکات، یان ڕوونکردنەوە، بەڵکو پێویستە بەکردار مەبەستەکان بگەیەنین، واتە ئەوەی دەمانەوێت فێری ببین دەبێت لە کردارو مامەڵەی ڕۆژانە لە خۆمانی وەربگرن، نەك هەموو ساتێ ئاڕاستە بکرێنو خودی ئێمەش ڕەچاوی نەکەین، چونکە منداڵ لەو تەمەنەدا بە باشی چاولێکەری دەکاتو تێبینی ڕووداوەکان دەکات، کاتێ هەستیکرد باوانی ئەوەی دەیکەن ئەوە نییە کە دەیڵێن گرێیەکی لا درووست دەبێتو ناتوانێ فەرمانەکان قبوڵ بکات.

چەند بنەمایەکی سەرەکی باس دەکەین، پێویستە هەر لە منداڵییەوە فێری ببێت، بۆ ئەوەی بۆ گەورە بوونی ڕابێت، ئەوانیش:-

۱- داخوازیو سوپاسکردن:-

دوو وشەن کاریگەری جادووییان هەیە، بەتایبەتی کاتێك لە منداڵەوە گوێمان لێ دەبێت، ئەوانیش "بە یارمەتیت"، "سوپاس"، (ئایا دەتوانم سەیری تەلەفزیۆن بکەم)، قسە لەگەڵ منداڵەکەت بکە هەمیشە ئەو وشانە بەکاربهێنە لەگەڵیدا، ڕێزی بگرە، سوپاسی بکە، ستایشی بکە لەسەر ئەو کارانەی پێیان هەڵدەستێ.

۲- نازناو:-

پێویستە منداڵ فێربکرێت پێش ناوهێنانی هەرکەسێك نازناو بەکاربهێنێت، بۆ نموونە کاك، دادە، مامە... هتد، بۆئەوەی لەلای ببێتە نەریت.

۳- ئادابی خوان:-

ئادابی خوان بۆ منداڵ زۆر جیاوازی نییە لە ئادابی گەورە، بۆ نموونە پێویستە لە کاتی نانخواردندا، پابەند بێت بە بێ دەنگییەوە، خواردنی ئەوەی لەبەردەمیدایە، نەك دەستدرێژکردن بۆ هەر لایەك کە بیەوێت، سەرەڕای ئەوەی قسە نەکردن بە دەنگی بەرزو بێزارکەرو کەوچك خستنەوە ناو دەمو فڕێدانی بۆ سەرزەویو یاریکردن بە ددانەکانی.

٤- تایبەتمەندێتی:-

پێویستە لەسەرمان منداڵ فێربکەین ڕێز لە تایبەتمەندی کەسانی تر بگرێت، بۆ نموونە:- فێربوونی باش گوێگرتن بۆ کەسانی ترو قسە پێ نەبڕین، ئەوە شتێکە زۆربەی منداڵەکان دەیکەن، بۆیە دەبێت لەو کاتەدا منداڵ ئاگاداربکرێتەوەو فێربکرێت، ئەوە ڕەفتارێکی نادرووستەو نابێت دووبارە ببێتەوە، گوێ نەگرتن بۆ پەیوەندیی تەلەفۆنی، گاڵتەنەکرن بە شتانی کەسانی ترو یاری پێکردنو فڕێدانی، لە دەرگادان پێش چوونە ژوورەوە.

٥- یاریکردن:-

یاریکردن هەلێکی گەورەیە بۆ گیانی هاوکاریو بەشداریکردنی منداڵو ڕێزگرتنی هاوڕێکانیو خۆشەویستییانو دوورکەوتنەوە لە خۆپەرستی لە کاتی یاریکردندا.

٦- تەوقەکردن:-

منداڵ فێری دەبێت کاتێك تێبینی باوانی دەکاتو چاویان لێدەکات، پێویستە هانی بدەین تەوقە بکاتو بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێرهاتن بکات.

تێبینی:- ئەو ڕەفتارانە تەنها بۆ ماڵو قوتابخانە نییە، بەڵکو پێویستە بۆ هەموو شوێنێکو هەموو کاتێکو لەگەڵ هەموو کەسێکدا پەیڕەوی بکات.

سەرچاوە: Adiezcorner

# دڵنیابە سبەینێ ڕۆژێکی باشت دەبێت لە قوتابخانە



هێشو والی

لەوانەیە قوتابخانە لای بەشێك لە منداڵەکان، بێتاقەتکەرو بێزارکەر بێت، زۆرجار منداڵان ڕۆژێکی ناخۆشیان دەبێت لە قوتابخانە، ئەمە وایان لێدەکات کە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە لە بێتاقەتیدا بگرین، یان هاوار بکەن. کاتێك هەندێك ڕووداوی ناخۆش ڕوودەدات، هەندێجار بەدەست خۆمان نییە بێتاقەت دەبین، لە هاوڕێکانمان، یان لە خێزانەکەمان، هەندێك شت دەڵێینو ئەنجامی دەدەین کە لە دواییدا لێی پەشیمان دەبینەوەو داخی بۆ دەخۆین. بەڵام چۆن بزانین کە هۆکاری ئەمانە قوتابخانە نینو قوتابخانە کەشێکی خۆشو ئاسوودەی هەیە، قوتابخانە بێتاقەتو بێزارت ناکات، قوتابخانە بەوشێوەیە نییە کە تۆ ئاوا خۆت بەهۆیەوە نیگەران بکەیت، باشە بۆچی زۆربەی خەڵك ناتوانن لەمە تێبگەن کە سەرەکیترین هۆکاری زۆربەی زۆری کێشەکانیان لە هەڵچوونو هەڵوێستەکانی خۆیانەوەیە؟ ئەوەش دەنگێکە، بەڵام لە هەمان کاتدا بێدەنگیشە کە لەناخی خۆتدایە، لەدوای جێبەجێکردنی ئەم خاڵانە سوپاسی خۆت دەکەیت، کە قوتابخانەش تەواوبوو دەبینیت ڕێگەیەکی ڕاستیان پیشانداویت.

هەنگاوەکان:-

**١- بە تەواوی هۆکاری ئەوە بزانە کە بۆچی حەزت لە قوتابخانە نییە؟ تێبینی ئەوە بکە کە چ کێشەیەکت لەگەڵ قوتابخانەدا هەیە:-** دەتەوێت هەموو شتێك بڵێیت، بەڵام بیرلە ڕاستییەکان بکەرەوە. پاش بیرکردنەوە چەندێك گۆڕان لە تواناتدا ڕوویداوە؟ لیستێك دروست بکەو ئەو شتە تایبەتیانەی تێدا بنوسە کەواتلێدەکەن بێزاربیت لە قوتابخانەو حەزدەکەی بیانگۆڕیت. پاشان بەباشی بیر لە چارەسەر بۆ کێشەکانت بکەرەوە. لەوانەشە بۆ ئەمە پێویستت بەوەببێت کە لەگەڵ مامۆستاکەتدا قسە بکەیت، یان مامۆستای توێژەری کۆمەڵایەتی قوتابخانەکەت، تەنانەت دەربارەی یاسا بنچینەییەکانی قوتابخانەش پرسیار بکەو کێشەکانت لە لیستەکەتدا بنوسە، ئینجا سەیری لیستەکەت بکەو لە سەرەتاوە دەست پێبکە. لەوانەشە ئەم کاتە ناخۆشترین کاتت بێت.

**٢- خۆت ئامادە بکەو دڵنیابە لەوەی کە سەرجەم پێداویستی تەواوت پێیە:-** با جانتاکەت چەند گیرفانێکی زۆری هەبێت، بۆ پێداویستیە زیادەکانت. ئەمانە خۆت دیاریان بکە، ئایا چ شتێکت پێبێتو چیت پێنەبێت، هاوکات لەگەڵ کتێبی وانەکانتدا، بۆ نموونە یەکێك لە گیرفانەکانی جانتا بچوکەکە بۆ قەڵەمو لاستیكو قەڵەم دادەرو ڕاستەو گۆشەپێو ...هتد. گیرفانێکی تر بۆ فریاکەوتنی خێرا، لەزگەو دەسڕو دژەخۆرو کرێمی دەستو بۆنبڕەو هەندێك پارەی زیادە. لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا سوودی هەڵگرتنی ئەم پێداویستیانە لەگەڵ خۆت دەزانیت.

**٣- با هەمیشە خەندەو دڵخۆشی بە دەموچاوتەوە دیاربێت، تەنانەت ئەگەر دڵخۆشیش نەبوویت گۆشەکانی لێوت بەرز بکەرەوە بۆئەوەی خەندەیەکی دروستکراو بە دەموچاوتەوە دیاربێت:-** بە خەندەوە سڵاو لە هاوڕێکانت بکەو خۆشدوبە، پێیانبڵێ کە جلەکانیان جوانە، ئەگەر پۆشاکێکی نوێیان پۆشیبوو. بەم شێوەیە والە ئەوان دەکەیت هەستێکی باشیان بەرانبەر بە خۆیانو تۆش دروست ببێت، ئەمە بۆ تۆش بە هەمان شێوەیە کە تۆش خەندە لەسەر ڕووخساری ئەوان دەبینیت. لە یادی مەکە:- ڕوخسارێکی باش + هەستکردن بە باشی= ڕۆژێکی خۆشو باش!

**٤- پاكو خاوێنیت ڕابگرە:-** هەموو ڕۆژێك پێش چوونە قوتابخانە دڵنیابە لە پاكو خاوێنی خۆتو جلوبەرگەکانت.

**٥- کاتی پێویست بخەوە، نەوەك لە کاتی وانەدا لەسەر مێزەکەت خەوت لێبکەوێت:-** پێش خەوتن دڵنیابە کە هەموو شتێکت بۆ سبەینێ ئامادەیە. جلەکانت، گرنگترین کار ئەوەیە ئەرکی ماڵەوەت تەواو کردبێت، شۆردنی ددانەکانت لەبیر نەکەیت! چونکە بەیانی دەمت بۆنی هات داخی بۆ دەخۆیت! بۆئەوەی پشویەکی باش بدەیت واباشترە پێش خەوتن کتێب بخوێنیتەوە، یان کوپێك شیر بخۆیتەوە، بەم شێوەیە بەزوویی خەوت لێدەکەوێت.

**٦- بۆ نانی بەیانی خواردنێکی تەندرووستانە بخۆ:-** واباشترە خواردنێك بخۆیت کە خێرایی کۆئەندامی سوڕان زیاد بکات، ئەمەش وادەکات وریا ببیتەوەو خەوت نەیەت:- ماست، گوێز، هەنگوین، توو، هەروەها شەربەتی پرتەقاڵو دانەوێڵەش، ئەمانە لە بەیانیاندا سوودی باشت پێدەگەیەنن، بەڵام خودی میوەکان لە بەیانیاندا مەخۆ! خۆراکی تەندرووستو سروشتی بخۆ.

**٧- ڕێگەمەدە هیچ کەسێك ڕێگەت لێبگرێت:-** کەسیش ناتوانێت ڕێت لێبگرێت، ئەگەر خۆت بەهێز بیتو ڕێگەیان پێ نەدەیت. لەسەر پێکانی خۆت ڕاوەستەو ڕۆژەکانی ژیانت بەو شێوەیە بەڕێبکە.

سەرچاوە: www.wikihow.com



ئەسکەندەر ڕەحیم

# ئاشتیی ماڵ!

پیرە پیاوێك، خۆشەویستییەکی بێئەندازەو لەڕادەبەدری بۆ هاوژینەکەی هەبوو، زۆر بەچاکە باسی دەکرد. دەمگوت دەبێت خاتوونەکەی، چی کردبێت، وا ئەم پیاوە هێندە خۆشیدەوێتو پێیدا هەڵدەڵێت. کاتێك چاوم بە خاتوونەکەی کەوت، زۆر خۆشحاڵ دیاربوو، بەختەوەری لێدەباری. لێم پرسی: وا دەردەکەوێت، هەمیشە بەختەوەریو ئاشتی لەماڵتدا هەبێت، دەکرێت نهێنیی بەختەوەریو ئاشتیی ماڵت لەگەڵ هاوسەرەکەتدا، بە من بڵێیت؛ ئاخۆ لەبەر پارەوپووڵە؟ یان لەبەر دەستیاوی خۆشی چێشتو نانتە؟! یاخود لەبەر ناسکیو جوانیتە؟! یاخود لەبەر خستنەوەی نەوەی زۆرە؟! یاوەکو لەبەر شتێکی دیکەیە؟!

خاتوونی پیر، گوتی: بەدیهاتنی ئاشتیو بەختەوەری لە ماڵدا، لەپاش خودا، بەدەستی ئافرەتە؛ ئافرەت دەتوانێت لە ماڵەکەیدا، بەهەشتێك سازبکات، یاخود دۆزەخێك دابخات.. پاشان گوتی: نەکەیت بڵێیت، نهێنیی بەختەوەریو ئاشتیی ماڵ، هەر پارەو کاسەی پڕە! چونکە زۆرێك لە ئافرەتە دەوڵەمەندەکان، دڵتەنگنو هاوسەرەکانیان لێیان هەڵدێن. هەمدیس زۆریی منداڵ نییە، چون ئافرەتی وا هەیە؛ ١٠ منداڵی خستووەتەوەو هاوسەرەکەی خۆشی ناوێت، ڕەنگە تەڵاقیشی بدات. زۆرێکیش لە ئافرەتان، لە نانو چێشت درووستکردندا، شارەزانو دەستیاویشیان زۆر خۆشە، کەچی گلەیی لەدەست خراپیی هەڵسوکەوتی هاوسەرەکانیان دەکەن.

منیش، سەرم لەم وەڵامانەی سوڕماو گوتم: دەی ئەگەر نهێنیی بەختەوەریو ئاشتیی ماڵ، هەموو ئەو شتانە نین، ئەی نهێنیی ئەم بەختەوەریو ئاشتییە، چییە؟!

خاتوونی بەتەمەن گوتی: هەر کاتێك هاوژینەکەم، تووڕە دەبێتو هەڵدەچێت، بێدەنگی دەکەم بە پیشەم، سەری ڕازیبوونیشی بۆ دەلەقێنم، بەڵام نەك بێدەنگیو بە چاوی گاڵتەوە تەماشاکردن، چونکە پیاو زیرەکەو زوو تێدەگات.

پاشان پرسیم: دەی بۆ لە ژوور، ناچیتە دەر؟ گوتی: دەستم دامێنت، نەکەیت وا بکەیت، چونکە وا دەزانێت، تۆ لێی بێزاریتو لەدەستی هەڵدێیتو ناشتەوێت گوێ لە قسەکانی ڕابگریت، پێویستە؛ هەتا هێور دەبێتەوە، تۆ بێدەنگ بیتو چی دەڵێت، لەگەڵیدا هاوڕا بیت، با قسەشت پێ بڵێت.. پاشان پێی دەڵێم: تەواو بوویت، دواتر دەچمە دەرەوە، چونکە ئەو ماندووبووەو پاش ئەو تووڕەبوونو هەڵچوونو هاتوهاوارە، پێویستی بە پشووە. ئیدی کە هاتمە دەر، کارەکانی ماڵەکەم تەواو دەکەم.

ئەمجا پرسیم: ئەدی دوای ئەوە، چ دەکەیت؟ ئایا بۆ ماوەی هەفتەیەك، یان زیاتر، قسەی لێ دادەبڕیت؟ گوتی: نا، ئەوە ڕەفتارێکی خراپە، تیغێکی دوو دەمە.. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ، لە کاتێکدا قسە لە مێردەکەت دادەبڕیت، کە ئەو پێویستی بە ئاشتەواییە، گەر وات کرد، ئیدی بەو بارە ڕادێتو ڕەنگە بەو ڕەفتارەت، داواکارییەکانی لێت، زۆرتر بکاتو لەوانەشە، پەنا بۆ سەرسەختیی زۆرتر ببات.

پرسیم: کەوابێت، چی دەکەیت؟ گوتی: دوای دوو سەعات، یان زیاتر، پەرداخێك ئاو، یان شەربەت، یاخود پیاڵەیەك چا، یاخود کووپێك قاوە، دەخەمە بەردەمیو بەدڵخۆشییەوە، پێی دەڵێم: فەرموو، نۆشی بکە، چونکە ئەو، بەڕاستی پێویستی بەوەیەو هەر بەئاساییو سرووشتیش، لەگەڵیدا دەدوێمو خۆم تێکنادەم. ئەوجا لێم دەپرسێت: تۆ لێم تووڕەیت، یا لێم زیزیت؟ منیش بەئاسایی دەڵێم: نا. ئیدی ئەویش داوای لێبوردن دەکاتو قسە جوانو نەرمونیانەکانی، بەگوێمدا دەدات.

منیش گوتم: جا تۆ، باوەڕ بەو قسە جوانو خۆشانەی دەکەیت؟ خاتوونی ژیر گوتی: بەدڵنیاییەوە بەڵێ، چونکە من، متمانەم بەخۆم هەیەو گێلو گەوج نیم، ئەتۆ لە منت دەوێت، باوەڕ بە قسەکانی کاتی تووڕەییو هەڵچوونەکەی بکەم، بەڵام باوەڕ بە قسەکانی کاتی ئارامیو لەسەرخۆییەکەی نەکەم!

گوتم: هاوژینەکەت، لە کاتی تووڕەبوونو هەڵچوونیدا، قسەی زبرو خراپی پێ گوتوویت؟

خاتوونی ژیر، گوتی: ڕێزو ئابڕووی من، بەندە بە ڕێزو ئابڕووی هاوژینەکەمو پەیوەندیی خۆشی نێوانمانەوە. ئەوە چ ڕێزو ئابڕوویەکە تۆ باسی دەکەیت، مەگەر ڕێزی لەوە شکاوترو ئابڕووی لەوە تکاوتر هەیە، کە منی لە بێبەرگیدا بینیوە؟!

لە ئاست ئەو وەڵامە بەجێیەدا، دەمم بوو بە تەڵەی تەقیوو لە دڵەوە، هەزار ئافەرینو دەستخۆشیم لێکرد.

# سرووشی سرووشت

زاهیر زانا

مـــرۆڤ بەکردنەوەی چاوی دڵو دەروونـــی دەتوانێت کۆمەڵێك شـــت ببینێت، کە چاوی سەر پەییان پێناباتو بە واڵاکردنی ڕۆحو بیـــری، دەگات بـــە لوتکەیەك، کە لەوێوە ئەســـتەمەکان ئاســـانتر دەبینێو زۆرێك لەو شتانەی تا ئێستا بەگەورەی زانیون لای بچوك دەبنەوەو دونیابینی دەگۆڕێو سەقفی حەزو خولیاو داخوازییەکانی بڵند تر دەبێو سروشو نیگا لە سروشت وەردەگرێتو لەدەستکردو بەدیهێنراوەکانی خوای گەورە تێڕامان دەکاتو حیکمەتو هونەریان لێوە فێر دەبێت، وەك سروشـــێ سودو کەڵکیان لێوەردەگرێت، وەك چـــۆن ئیبن حەجەری عەســـقەلانی کاتێك بێزاربـــوو لە خوێندنو بێ هیوابوو لە فێربوون ویســـتی کۆڵبـــداتو بگەڕێتەوە، لە ڕێگای گەڕانەوەی لە شـــوێنێك لایدا بۆ حەوانەوەو پشوو وەرگرتن، بینی دڵۆپـــێ ئاو دێتە خوارەوەو دەدا لەبەردێكو بەردەکەی کونکردووە، بۆیە هەڵوێســـتەیەکی کردو سروشێکی لەو دڵۆپە ئاوە وەرگرت کە ئەگەر دڵۆپێ ئاو بـــەو بچوکیو نەرمییەوە بتوانێ ئەو بەردە کون بـــکات، ئـــەوا ئەمیش دەتوانـــێ بەبەردەوامی زانســـتو زانیاری کۆ بکاتەوە، بۆیە گەڕایەوە بۆ لای مامۆستاکەیو بوو بەو کەڵە پیاوەی کە ناوی لەمێژوودا تۆمارە، دەبێت ئێمەش بیربکەینەوەو تێڕابمێنین لەو سروشـــتەی کە هەمووی بەئەندازەی ڕێكوپێك دروســـتکراوەو وەك مامۆســـتایەکی بێدەنگو بێدار بە گوێماندا دەسرپێنێو بیرو هۆشـــمان گەشو ڕووناك دەکاتەوە، ئەم بیرکردنەوەو تێفکرینەش فەرمانـــی پەروەردگارو کردگاری سروشـــتو بونەوەرە، لەبەرئەوەی لەچەندین شـــوێنی قورئانی پیـــرۆزدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئادەمیزاد بۆ بیرناکەنەوەو وردنابنەوە لە دروســـتکردنی ئاســـمانو زەویو هاتنی شەوو ڕۆژو... هتد.

مـــرۆڤ ســـەرداری بوونەوەرانە، بەڵام دەشـــێت لـــە بێ گیانو گیانلەبەرەکانی تریشـــەوە شـــت فێـــر ببێت، وەك ئەو ســـاتەی کە کوڕەکانی ئادەم (ســـەلامی خوای لێبێت) یەکیان دەکوژێتو نازانێـــت چی لێ بکات، تا خوای گـــەورە دوو قەلەرەش دەنێرێتو



یەکیان یەکیان دەکوژێتو پاشان دەیشارێتەوە تا لەو قەلە ڕەشەوە فێری ناشتنی براکەی ببێت، هەروەها زۆرێك لە ئامێرو کەلو پەلەکانی کە ئێستا مایەی سودو کەڵکن بۆ مرۆڤ لەسەر شکڵو شێوەی کۆمەڵێ گیانەوەر دروستکراون، بۆیە دەکرێ لەهەر شتێکەوە حیکمەتو سودێك وەربگرینو وانەیەك فێربین، دەگونجێت نیگای ئەوە لەمێروله وەربگرین کە کۆڵنەدانو بەردەوامی مایەی ژیانەو بەیەکەوە کارکردنو ڕێکخستنی کارەکانیش هۆکاری بەهێزیو پتەویو سەرکەوتنە، لە هەنگەوە سروشی ئەوە وەربگرین کە پەیداکردنی شیرینی لەگوڵەکانەوە بەدەستدێت، گەر بمانەوێت شیرینو ئەزیزبین، دەبێت خەریکی کۆکردنەوەی چاکیو جوانیەکانبینو گەر شیلەی گوڵ نەمژێت بەرهەمت هەنگوین نابێت، دەبێت لە چیاوە فێربین گەر بمانەوێت بەهێزبین دەبێت وەکو ئەو ڕەگ داکوتاوبین، سروشی ئەوە لە درەختەوە وەربگرین گەر پاییزی ژیانیش ڕووی کردە ئێمە، لە زستاندا ورە ڕوخاوو ئیرادە لاواز نەبینو چاوەڕێی چرۆکردنو گوڵ دەرکردنی وەرزی نوێبینو بە سەختیەکان بڵێین: (هەموو ئەوەی دێتە ڕێگام.. کەم ناکات لە خەمو خولیام.. ژیان چەند سەخت بنوێنێ.. من سەختترم بەهیوام).

لەهەورو بارانەوە سروشی بەخشندەیی وەربگرینو بەرامبەر هەموو کەس دڵفراوانو دەست کراوەبین، وەك خۆر بۆ هەموو کەس بەشەوقبینو داوای سوپاسیش لە کەس نەکەین، لە کاتی سەیرکردنو تێڕامانمان لە ڕووبارو دەریاچەکان دەبێت ئەو پەیامەیان لێوە فێربین کە قۆناغ نییە بۆ سەرەوتنو دەبێت هەر بەردەوامبین، چۆن ئەوان تا بڕۆن بەو بەردانەی دێتە ڕێیان ڕووناکو خاوێنوپاك دەبنەوەو بەیەکگرتنیشیان زەریاکان دروست دەکەن، ئێمەش لە ڕێگای ژیانماندا خەریکی خاوێنکردنەوەی دڵو دەروونو بیرمانبینو پشتیوانی یەکتریش بکەین تا بەهێزترو گەورەتربین، سروشی ئەوە لە زەریاکان وەربگرین کە بە ئاسانی لێڵ نەبینو نەشڵەژێینو ئەو شتانەشی بەرامبەرمان دەکرێت فەرامۆشی بکەین، هەروەك زەریا هەر شتێکی تێ فڕێ بدەی لەناو گەورەیی خۆیدا نوقمی دەکات، لەداری بەردارو بەبەرهەمەوە پەیامی خاکی بونو خزمەت وەربگرین، چونکە هەتا بەرهەمەکەی زۆرتربێت پەلکەکانی زیاتر شۆڕ دەبێتەوە ئێمەش هەرچەندە خزمەت بکەین دەبێت زیاتر خاکیو خۆ بەکەمگربین!

کەواتە با کاتێکمان هەبێت هیچ نەکەین تەنها ڕابمێنینو سەرنج بدەین، پێویستە جارجار لەجەنجاڵییەکانی ژیان دوور بکەوینەوەو بچینە تەنیشت کانیاوەکانو لەبن سێبەری دارەختەکاندا چەند ساتێك بە هێمنی لەسروشت وردبینەوەو سروشی لێوەربگرینو بەچیاکاندا هەڵبگەڕێین تا لە لوتکەوە بڕوانینو ببینین بۆ گەیشتن بەبەرزی پێویستمان بە هەوڵو ماندوبونەو فێربین کە گردو شیوو تەپۆلکەکانیش گرنگی خۆیان هەیە، چونکە ئێمە لە ڕێگای ئەوانەوە گەیشتوینەتە ئەم لوتکەیە.

بە هیوای ژیانێکی ئاسودەو کامەرانو لێوان لێو لە وردبونەوەو تێڕامانو تێگەیشتن لەو سروشەی کە بەبێدەنگی لە ڕێگای سروشتەوە پێمان دەدرێت.

# ئەو کاتەی ویژدان دەمرێت

شڤان ئەحمەد

ئەو کاتەی ویژدان دەمرێت.. هەرچی ڕەوشتی جوانە دەست لە ناو دەست دەکەنو لە کۆلانە تەنگەبەرەکانی ژیانەوە ئاوا دەبن، شەرمو ڕاستگۆیش سەرهەڵدەگرنو هەتا زیندووبونەوەی ویژدان ناگەڕێنەوە، دڵسۆزی دەبێتە بێکەسترینو هەژارترین ڕەوشت، خیانەتو داوێنپیسیو درۆ، وەك مانگی چواردە دەدرەوشێنەوە.

ئەو کاتەی ویژدان دەمرێت.. بیری مرۆڤ لیل دەبێت، نە دەتوانێ سپی لە ڕەش جیا بکاتەوە، نە حەق لە ناحەق، نهێنییەکان وەك تیری لە کەوان دەرچوو، دەچن بە ئاسمانداو ئاشکرا دەبن، تەرازووی دادپەروەری بۆ هەمیشە لاسەنگ دەبێت، ئیتر ناگەڕێتەوە باری هاوسەنگی.

ئەو کاتەی ویژدان دەمرێت.. نرخی خوێنی مرۆڤێك هەرزانتر دەبێت، لە نرخی شەربەتێك، بێنرخترین کاڵا، ژیانی مرۆڤە، هەرچی مانای مرۆڤایەتییە لە مرۆڤ دادەماڵرێت.

ئەو کاتەی ویژدان دەمرێت.. گوڵەکان بێناز بێناز لە ژێر تیشکی لاوازی خۆردا سەریان لە ژێر پۆستاڵەکاندا فیدای ژیان دەبێت، ئای لەو ڕۆژەی ویژدان دەمرێت، نازانی چۆن دڵەکان تارمایی دایان دەپۆشێت، چۆن خەم هەواری هەڵدەداتو دەبێتە سایەو سێبەری بێدەرەتانەکان، ژیان هەرچی خۆشبەختییە وەك منداڵێکی بێباوك، کوچە بە کوچەی نیشتیمان دەگەڕێت، سەرگەردان خۆی!

ئەو کاتەی ویژدان دەمرێت.. چاوەکان ئەبلەق دەبن، گوێیەکان نابیستن، پیادەکان ڕێدەکەن، بەلام بە تاریکی خەون دەبینرێت، مرۆڤ بە ئیفلیجی دێتە دونیا، ڕەحمو میهرەبانی فڕێدەدرێنە دونیای خەیاڵ.

ئەی هاوژیانم، ئەیێ مرۆڤ دۆستان، هەرچی ڕۆیشت لێیگەڕێن با بڕوا، هەرکەس مرد فەرمانی خودایە، لێیگەڕێن با کۆچ بکات، بەلام ئامان مەهێڵن ویژدان بڕوا، هەموو تواناکانتان خەرج بکەن، بۆئەوەی ویژدان کۆچ نەکات.

چونکە ئەگەر مرۆڤ ویژدانی مرد، ژیان دەبێتە پارچەیەك ڕقو قینو شەڕو ئاژاوەو کوشتنو بڕین!

شەقیکە، غەیری حوببی تۆی تێدابێ
به دەستی خۆت دڵم دەربێنە قوربان -نالی-

# ئیمپراتۆری دڵم!

جگە لە خشەی گەڵای وەریو کە باخەوانە ڕدێن چەرمووەکە، کۆی دەکردنەوە، دەنگێکی دی نەدەبیسترا، ئەو ساڵەهای ساڵە گەڵای زەرد کۆدەکاتەوەو ڕۆژەکانی تەمەنیشی پەرش‌و بڵاو..

گەڵاڕێزان گوڵی باخانی دابا
بەهارێ دیکە دێ ئەم داخە لابا
هەناسەی باخەوانی پیرە دەیگوت!
هەزاران خۆزگە ژینی من‌وەها با! شەریف

بەڵام شازادەکەم من شادم بەوەی گەڵاکانی تەمەنم بۆ گەیشتن بە بەهاری مەملەکەتەکەی تۆ بەخشی!

دەزانم لە جێی هەموو گەلایەکی وەریو گوڵاڵەیەکی سوورم پێ دەبەخشی!

ئیدی هەناسە بۆ ڕۆژانی تەمەنم هەڵناکێشم، بە عومری بابردووی نازانم!

ئەو ڕۆژانەی من گەڵای تەمەنم دەوەراند، لە چاوەڕوانی تۆدا وەستابووم، چما گەیشتن بە تۆ هێندە ئاسانە؟

گەیشتن بە مێرگی ئاواتو کانیاوی حەزو باوەشی هەستو نەستو سۆزو یانەی دڵ، ئەگەر لە دوا ساتەکانی ژیان‌و دواهەناسەکانی تەمەنیشدا بێت مورادێکی هێندە بەرزە، بەهای بە هەموو تەمەن سەودا ناکرێ!

ئای کە چەند خۆشە ژیان‌و عومرم
لە خاکو پای تۆ، گیان دەرچێ بمرم وەلی دێوانە

بە گەیشــتنم بە تۆ، گەیشــتمە ئەو دەفەرەی کە ئیدی نە خۆری ئاوا دەبێتو نە بۆنی بارانی لێ دەبڕێ..

لە نێوەڕاســتی بەهاردا لە نێو گوڵســتانو گوڵزاری گوڵاوو ڕێحانەدا بۆ بۆنی تۆ دەگەڕام..

لە نێو زیخی شۆراوی نێو کانیو چەمی بەفراودا، بۆ نیگای پاکو دڵی شۆراوت دەگەڕام..

لە نێــو ناڵــەو چریکــەی ڕەوە قولینگەکانــی گەرمیانو کوێستاندا، بۆ ئاوازی تۆ دەگەڕام!

شــیعرم نوســیو چیرۆکم دانــاو بوخچەیەکــم پڕکرد لە یادگاری!

بڕیارم دا بۆ تۆ نەبێ بۆ کەسی نەخوێنمەوە!

تەنها بۆ ئەو شوێنە دەگەڕام کە تۆی لێ دەژی، ئەو شوێنەم بــە لاوە گرنگ نەبوو کە خۆمی تێدا دەژیم، چونکە دەمزانی بە هاتنی تۆ هەموو شتێك دەگۆڕێ!

چەنــدە خۆشە "حــەمــدی" جــارێ بێتە ئــەم وێرانــەیە
جا دەبێتــە قــەصری جــەنــنــەت، کوڵــبەی ئــەحزانی من

ئەگــەر هەموو عومری فانیو باقیم بکەمە شاباشــی ئەو ڕۆژەی تەشریفت هێنا، هێشتا ناتوانم لەسەر ئادابی مەحەببەتو مەراسیمی ئەوین، دڵۆپێك لە دەریای خۆشەویستیم دەربڕم!

گــەر تۆ نەبای ڕۆحم بە کێ ئاشــنا باو لە لای کێ وانەی ئەوینــی خوێندبا، کــێ لە تاریکســتانی عەدەم دەســتەکانی گرتباو ببوایە بە هاودەمی ڕۆحم!؟

من حەکایەتی دڵم بۆ کێ باسکردبا؟

کێ فرمێسکەکانی بۆ سڕیباو ئارامی ببەخشیایە بە ناخم؟

شەوانە دەردی دڵو شەکوای ڕۆحم بۆ کێ بەیان کردبا!

کێ پەڕاوی دڵی منی دەکردەوەو دێڕبەدێڕی دەخوێندەوە!

لەگەڵ کێدا فرمێســکم ڕشــتباو بە ڕووی کێدا لە ناخەوە پێکەنیبام!

گەیشتن بە تۆ سانا نەبوو، شازادەکەی دەفەری ڕۆحم!

سەیرن ئەوانەی وادەزانن ئەویینداری هێندە ئاسانە! نازانم چۆن دەتوانن ناوی عیشقو ئەوین بهێنن!؟

ئــەوان جگە لەو ناوە هیچــی دی نازانن! چما ئەوان بۆنی عیشقیان کردووە؟

نا هەرگیز....!

تەنها سروەیەکی گوڵاوی ئەوین، مرۆڤ مەست دەکاتو بە جیهانێکی ئەفسوناوی ئاشنا دەکا!

جیهانێك شوێنو جێگای بۆ نییە!

تۆ لە هەر شــوێنێ بووی من لەوێم! بۆ هەر شــوێنێ بچی هاودەمتم، ئیدی ناتوانم چرکەیەك لێت جودابم!

دوای زەمەنێك لە ناڵەی جودایيو غوربەتی ڕۆحو تەنیایی دڵ، ئیدی بێ هاودەمی هەستو نەستم نامەوێت هەناسە بدەم!

دوور لــە نیــگای تۆ کوێرو دوور لــە چرپەی تۆ کەڕو بێ گفتوگۆی شیرینی تۆ لاڵم!

مــن ئیدی ناتوانم بێ فەرمانی ئیمپراتۆری دڵم بســرەوم، هەمیشە دەستەونەزەر بۆ بەخشینی ڕۆحم لە خزمەتتدام.

لــە بــۆ وەصــڵــی جــەمــاڵــی یــاری کــوردی
ئــەگــەر ڕۆحــم نــــەدەم، نــامــەردم ئــەمــڕۆ

ژیان لە خزمەتی تۆدا حەلاوەتی ڕۆحو سکونەتی سەکینەی ئارامیو دڵنیاییو ئیتمینانی حەقیقییە!

هەروەکــو ڕۆمی دەڵێت: گەر شــەکر دەیزانی عیشــقی تۆ چەند شــیرینە، لە شــەرما دەبووە دڵۆپێك ئاوو شــانازی بە شیرینی خۆیەوە نەدەکرد!

ئای خودایە گرتنەبەری ڕێگەی ئەوین چەند دژوارە، وەلێ لە یەکەم ساتی گەیشتنە نێو مەملەکەتی ئەوین هەموو تاڵیو ناڕەحەتییەکان بیر دەچنەوە!

بارێك خەمو پەژارەو هەناســەی ســاردو دەردی بێ تۆییو چیرۆکی تەنیاییم ئامادە کردبوو، وەلێ کە تەشــریفتان هێنا لە خۆشیدا هیچم وەبیر نەما!

لە نێو خەندەکانی تۆدا هەموو توانەوە! بە هاتنی تۆ ئیتر من خەمێکم نەما!

کــە خــضــر ئــەو خــاکــو خــۆڵــەی بــــەردەری دی
وتــی تــۆ خــاکــی، یــا ئــاوی حــەیــاتــی -مەحوی-

لێرەدا ژیان ڕەنگێکی دیو سەعادەتو وێنەیەکی دی هەیە، لێرەدا هەردووکمان بۆ یەك ئاڕاســتە دەڕوانینو بە یەك ئاواز پێ دەکەنینو بۆ یەك ئامانج فرمێسك دەڕێژین، لێرەدا خودی خۆمان لە یاد دەکەینو لە یەکتردا دەتوێینەوە.

ئیــدی ناتوانین بێ یەکتر هەناســە بدەیــنو پەرداخێك بخەینە سەر لێومان!

شەوانە بێ بۆنی کراسی یوسفینت، خەو ناچێتە چاوانم!

ئەوینــی مــنو تۆ ناســنامەی ڕۆحە، یــەك چرکە قبوڵی غەفڵەت ناکا!!!

جگە لە تۆ کەس نەیتوانی بێتو لەســەر شــەپۆلی ڕۆحم شادەمارەکانی دڵم تەیکاو بە ناخمدا ڕۆبچێ!

کــەس نەیتوانی گرێی دڵم بکاتــەوەو وەکو ئیمپراتۆرێکی سەرکەش ئاڵای ئەوین لە نێوەڕاستی دڵمدا بچەقێنێ!

منو تۆ زادەی یەك خاکو خۆڵو بۆی یەك بەهارو شەپۆلی یەك دەریاین!

لەگەڵ تۆدا خۆم خۆشەوێ! دڵخۆشم بە ترپەی دڵم، ژیانم لا شیرینە!

چونکە لە بەهەشتی دڵی تۆدا دەژیم!

هەرگیــز نیشــتمانێك نییە لەو دڵە گەورەتــر بێ کە بێ سنور خۆشی دەوێی!

کە شەیتان تاقی میحرابی بــرۆی تــۆی دی وتــی: یــاڕەب
لە ســوجدەی حــەزرەتــی ئــادەم ســەری خــۆم بــۆ چ دانــاوە

حاجی قادری کۆیی

گەرمیانی

# الهی

# نامە نوریەکان

نامەی سروسن

إليك وإلا لاتشد الركائب ومنك وإلا فالمؤمل خائب
وفيك وإلا فالكلام مضيعوعنك وإلا فالمحدث كاذب

خودایـــە، پـــەروەردگاری مەزن، جگە بۆ لای تۆ، ستـەمە کاروان بکەوێتـــە ڕێو هیواخـــواز جگە لە تـــۆ، ئەر هیوای بە کەس بێت، ئەوا تکای بێهودەو داری خۆزگەی بێوەر دەبێ!

سەناو ســتایش تەنها شایستەی تۆیەو قسەو گفتوگۆ، گەر لەبـــارەی گەورەیی تۆوە نەبێ، بێ کەڵکو بێ ســـودەو ئەوەی بگوترێ جگە لە وەسفی گەورەییو بلندی تۆ هەمووی ناڕاستە!

ئازیـــزم: ئەو کاتەی بازاڕی کەســادی مرۆڤـــە بچکۆلەکان جێدێڵـــیو ڕوودەکەیتە گوڵزاری بێ ســـنووری ئیلاهی، لەوێدا ئارامی دەبێتە میوانی هەمیشەیی دڵو پڕوشەی بارانی میهری خودایی ڕۆحت دەشـــواتەوەو ســـروەی بەزەییو ســـۆزی خودا گوڵبارانی باخچەی هیواو خۆزگەو ئاواتەکانت دەکات.

کـــە دەچیتە نێو گوڵســـتان ((وهـــو معكم اينمـــا كنتم)) (لاتدركه الابصار وهو يدرك الابصار) ئیدی خەم ماڵاواییت لێ دەکاو دڵەڕاوکێ ئەدرەسی دڵت نادۆزێتەوە!

خـــۆ ئەگەر لەگەڵ ســـەروەردا بژی ((اللهـــم انا بك وإليك، لاملجـــى ولا منجـــى منك إلا إليـــك)) ئەوە ئیـــدی دڵنیا دەبی کە جگە لە پەناو پەســـێرو ســـایەی ئەو، شوێنێکی دیت نین! هێزێك هەرگیز شکســـت ناناســـێو گەورەیـــەك کە هەرگیز لە گەورەیی ناکەوێت تەنها (الله)یە!!

بـــۆ کوێ دەچی ئازیزم، لەم دەڤەری نورە زیاتر شـــوێنێك

هەیە بۆ حەوانەوە، پەنایەك هەیە بۆ پشوو، بەهەشتێك هەیە بۆ ڕۆح؟!

ئافرەتێك باوەشی بە پەردەی کابەدا کردبوو دەیگوت: (یا وحشتی بعد أنسی، یا ذلي بعد عزي، یا فقري بعد غنائي)!

پێیان گوت ئەوە بۆ ئاوا هاوار دەکەی، بەڵایەکت لێ قەوماوە، سەروەتو سامانێکت لەدەستداوە؟! گوتی: ( لا، ولکن کان لي قلب فقدته)!

گوتیان: ئەمە بوو ئەو بەڵایەی باسی دەکەی؟! گوتی: (وأي مصیبة أعظم من فقد القلوب وانقطاعها عن المحبوب)!

بێگومان زۆر ڕاستە: چی بەڵایەك گەورەترە لە دابڕانی دڵ لە خۆشەویستەکەی!

دڵی موسوڵمان هەمیشە ئاوێزانی عەرشی ئیلاهییە! پەروانەی دەوری چرای ئیمانو فەرمانی خودایە، جا پێم خۆشە ئازیزم دوای ئەوەی لە نامەی ڕابردوودا لە بارەی (تەوحیدی ربوبیەتەوە) دوام، ئەمجارە لەبارەی (تەوحیدی ئولوهیەتەوە) بدوێم.

ئیبنولقەیم دەفەرموێ:

وعبادة الرحمن غاية حبه
مع ذل عابده هما قطبان

ئێمە کە پەروەردگارمان ناسیو بەگەورەییو دەسەڵاتی بێ سنووری ئاشنابووین، دەبێت ملکەچی ئەو پەروەردگارە بین! نێوچەوانی بەندایەتی بخەینە سەر زەوی، ملکەچیو بە تەواوی خۆشەویستیو ئەوینو تەواوی تەسلیمەوە پەیمانی عبودیەت لەگەڵ خوداوەندا ببەستین...

ئەو کات جگە لە (اللە) مەعبودو مەئلوهو خودایەك ناناسین.

﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾ هود: ١٢٣

ئیدی دوعاو نزاو تکاو ڕەجاو پاڕانەوەو لالانەوەو هیواو ئاواتو حەزو خۆزگەو هەستو نەستو سکاڵاو هاوارو حاجاتو ئاتاجمان تەنها لەو داوا دەکەین، چونکە دەزانین کەس بێ ویستی خودا هیچی پێ ناکرێ لەم گەردوونەدا، ئەوانەی کە خەڵکی دەیانپەرستنو هاواریان لێ دەکەنو لێیان دەپاڕێنەوەو دڵیان پێوەی پەیوەستە، دەسەڵاتی مێشێکیان نییە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ ﴾ الحج: ٧٣

لە تاریفی تەوحیدی ربوبییەتدا گوتمان ئەم جۆرەی تەوحید زانایان بە کورتی وەها پێناسەی دەکەن (هو توحید الله فی افعاله) واتە: یەکتاپەرستی خوداوەند لە کارەکانیدا)، سەبارەت بە تەوحیدی ئولوهیەتیش دەڵێن: (هو توحید الله فی افعالنا).

پێچەوانە بە ئەو ئەمیان یەکتاپەرستی خودای گەورەیە لەو کارانەدا کە ئێمە ئەنجامی دەدەین! واتە هەرچی کارێك کە دەیکەین تەنها بۆ ئەوی ئەنجام دەدەینو لە پێناوی ئەو خودایە مەزنەدا دەیکەین!

جا ئەو کارانە کاری لاشە بن، یا دڵ! نوێژو نزاو پاڕانەوەو کارو کرداری زاهیرین، یا خۆشەویستیو ترسو تەقواو خەشیەو تەسلیمو تەوەککول کە کارو کرداری دڵو نێوەڕۆکی موسوڵمانن!!

بەڵگەکانی خودایەتی خوداوەندو یەکتایی لە ئولوهیەتدا، بێ شومارن، خوداوەند خۆی لە قوئانی پیرۆزدا زۆر بە سانایی بۆمان ڕوون دەکاتەوە:

﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ المؤمنون: ٩١

خوداوەند نەوەی نینو هیچ خودایەکی لەگەڵ نییە، ئەگەر خودایەکی دی لەگەڵ خودایا هەبا، ئەوا هەر کەسەو دەستی بەسەر مەخلوقاتی خۆیدا دەگرتو هەوڵی دەستبەسەراگرتنی موڵکی یەکدییان دەداو بەم کارەش، سیستەمی گەردون لێك دەترازاو دونیا وێران دەبوو.

پاکیو بێگەردی بۆ خودا لە وەسفی موشریکان یاخود دەفەرموێ:

﴿ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ ﴾ الإسراء: ٤٢ ئەگەر لەگەڵ خودادا خودایانی دی هەبان، ئەوا هەموو هەوڵی زاڵبوونو سەرکەوتنیان بەسەر خاوەنی عەرشدا دەداو دەیانویست خۆیان خاوەن عەرشو دەسەڵات بن!

ئەو کات کەونو گەردون دەبووە مەیدانی ململانێی خوداکان!

وەلێ جگە لە (اللە) خاوەنی عەرشو دەسەڵاتو ﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المؤمنون: ١١٦

کەواتە با دڵەکانمان جگە لەو خودایە ڕوگەیەکی دی نەناسێو لە دەستی دەسەڵاتی ئەوەوە نەبێت چاوەڕوانی هیچ کەرەمو خەڵاتێك نەکات.

ئەو خودا گەورەیەش بەسە بۆ کەسێك کە بە تەواوی ئیتمینانەوە پشتی پێ بەستووەو ڕووی نازو نیازی گرتۆتە ئەو!

ع.ش.شێرکۆ

# لەگەڵ قانعی شاعیردا



چوار سیفەت مەوجودە بۆ من بۆیە هیچ کەس نایەوێم
قانعی یەك، شیعر دوو، ڕووخۆشی سێ، مەلا چوار

قانعی شاعیری چەوساوەکانی کورد، ناوی شێخ محمد کوڕی شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ سەعیدی دۆڵاشییەو لە (١٥)ی ئەیلولی ساڵی ١٨٩٨ لە گوندی «ڕیشێن»ی بناری شارەزوور لە دایکبووە.

«قانع» دوای ژیانێکی پڕ دەربەدەریو چەرمەسەریو تێکۆشان لە پێناو مافی ڕەوای کوردو کوردستانو هەوڵدان بۆ پێشکەوتنو فێربوونی نەوەکانی کوردو ڕزگاربونیان لە دەستی نەزانیو نەفامیو دەسەڵاتی داگیرکەران، دوای ئەوەی لەو پێناوەدا چەندین جار خراوەتە زیندان، ساڵی ١٩٦٥ بە یەکجاری ماڵاوایی لەم دنیایە دەکات.

### ئاڵاکەم

ئەی ئاڵای بەرزی سێ ڕەنگی جوان
هەر شەکاوەبی، تا ئاخر زەمان
تۆ یادگاری سەلاحەدینی
خوا کۆمەکت بێ، چەندە شیرینی
کوردان بە بێ تۆ، چەشنی شەسیربوون
لەناو زینداندا بەندی زنجیر بوون
لاوی کوردستان هیممەتی نوان
کە تۆی هەڵکردو زنجیری شکان
کەریم خانی زەند، بابا ئاردەڵان
فیداکاری تۆن، بە دڵو بە گیان
سووریت نیشانەی شەهیدانمانە
سەوزیت نیشانەی دەخڵو دانمانە
سپیت نیشانەی ئاشتی وڵاتە
ڕۆژی ڕووناکی ڕێگەی نەجاتە
گەنمت یانی هەای کوردە بزانە
نانی خۆت مەنێ دەستی بێگانە
قەڵەمت مانای، تا ڕۆژی مردن
تێکۆشن لە ڕێی زانینو خوێندن
ئیتر هەر بژی ئاڵای کوردستان
هەر پایەدار بێ تا چەرخی دەوران

### سێ سێی قانع

سێ شتن لە دنیا بێ وەجاخو جێگەدار
شاعیران یەك، عالمان دوو، نیشتمانی کوردەوار
سێ شتن لەم دەورەدا، هیچ شۆرەتو ناویان نییە
عەیبی دەوڵەمەندو شیعری قانعو مەرگی هەژار
وەك پڵاوی خانەقا ئیسمێکی بێ جسمن برا
یەك مرووەت، دوو سەخاوەت، سێ وەفای عەهدو قەرار
سێ نەخۆشی کەوتە دنیا، هیچ دەواو چاریان نییە
کیبر یەك، بەرتیل دوو، سێ موخلسی پارەو دینار
سێ مەتاعی پڕ بەها ئەمڕۆ تەواو بێ قیمەتن
یەك شیعر، دوو ڕاستی، سێ حورمەتی خاكو دیار
بێ وەفایی لازمەی سێ تایەفەن لەم کاتەدا
دولبەران یەك، کورسی دوو، سێهەم گوڵی خونچەی بەهار
سێ کەسن هەرگیز بە مەیلو ئارەزووی خۆیان نەگەن
قانعی یەك، برسی دوو، سێ بولبولی دێوانەکار